## لەم ژمارەیەدا




**رۆشــــنبیری نــوێ**

**گۆڤارێکی رۆشـنبیری گشتی مانـگانـەیـە**

**دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی دەری دەکات**

سەر نووسەر

مصلح مصطفى جەلالي



# سڵاو له جەژنی ئایار سڵاو له سوپای دلێر سڵاو له سەرۆکی فەرماندە



ساڵ ، ساڵی ١٨٨٦ سه ...

« لەم رۆژە بەدواوە ، ئەبێ کرێکار لەهەشت سەعات پتر کار نەکات .. هەشت سەعاتمان ئەوێ بۆ کار ، هەشت سەعاتمان ئەوێ بۆ حەسانەوە ، هەشت سەعاتیشمان ئەوێ بۆ پەروەردەکردن .. »

رۆژیش رۆژی (١) ئایار بوو .. ئەورۆژە سپی‌یە تێکەڵی خوێنی ئاڵی کرێکاران بوو .. تێکەڵی نرکەو ناڵەی ستەمدیدەکان‌و نووزەی برسییەکان بوو .. قەسابخانەکانە سازدراو سەرمایەدارە چڵێسەکان ، داسی درووێنەکردنی گەردنی فیرازی کرێکارانیان ، گرتە دەست‌و چوار قارەمانیان لێ کوشتن‌و سەدەهایان لێ گرتن‌و برنیدار کردن ...

ساڵ سووڕایەوە ، بوو بەساڵی ١٨٨٧و لە مەیدانی (های‌مارکێت)ی شاری شیکاگۆدا ، هەمدیس کرێکارانی چاونەترس کۆبوونەوەو دەنگی

ناڕەزایی‌و تووڕەیی خۆیان هەڵبڕی ..
رۆژ رۆیی‌و رۆژ هات .. هەزاران کارەسات‌و رووداوی جگەربڕو خوێناوی قەوما ..

ساڵ بوو بەساڵی ١٨٨٨و کۆنگرەی (سانت لویس) بەسترا .. لەو کۆنگرەیەدا بڕیاردرا خۆپیشاندانێکی گەورەو شایان ، بۆ یادی ئەو کرێکارە بێ گوناهو قارەمانانەی کە بەناحەق لەسێدارە دران ، بسازێنرێ .. رۆژی یەکی ئایاری ساڵی داهاتووش ـ ١٨٨٩ ـ بکرێ بە (جەژنی کرێکارانی جیهان) ..

بڕیارەکە سەری‌گرت‌و لەو رۆژەوە ، ساڵ بەدوای ساڵ ، سەرلەبەری جیهان ددانیان بەو رۆژو بەو جەژنەیە نا .. وهەموو مرۆڤایەتی خەباتکەریش، لەگەڵ چینی بەجەرگی کرێکاراندا کەوتنە چەژنە پیرۆزەو گەردن ئازادی‌یەوە .. !

* هەر لەسەر ئەم رەوت‌و بنچینەیەش ؛ چونکە ئەم چینە چاونەترساوە ، چینێکی هەرەشۆرشگێری نێو کۆمەڵی عیراقەو خاوەنی هەستی پاکی مرۆڤانەو شۆرشگێڕانەیەو هەڵگری مەشخەڵی گڕگرتووی مێژووەو پێشەنگی کاروانی خەباتە ؛ بۆیە حیزبی سەرکردە ، حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی لە یەکەم رۆژی سەرهەڵدانیەوە ، باوەڕێکی زۆر قایم‌و پتەوی بەم چینە هەیەو هەبووە .. هەربۆیە لەگەڵ بەرپابوونی شۆرشی نەمری ١٧ ـ ٣٠ ی تەمووزی ساڵی ١٩٦٨ سەوە ، هەوڵی خولقاندنی کادیری کریکارانەی داوەو بەوردی هەموو لایەنێکی سیاسی‌و ئابووری ورۆشنبیری‌و کۆمەڵایەتی ئەم چینەی دەس‌نیشان کردووە ؛ لەپێناوی بنیادنانی کۆمەڵگەیەکی بەرزی ئیشتراکی‌دا ..

لەم چواردە ساڵەی ژیانی شۆڕشیشدا ، گەلێ قانونی چەشناوچەشن بۆ ئەو مەبەستە پیرۆزە دەرچووە ؛ لەوانەیش :

(قانونی‌کار) ی ژمارە (١٥١)ی ساڵی ١٩٧٠و قانونی (خانەنشینی‌و دەستەبەری کۆمەڵایەتی کریکارانی» ساڵی ١٩٧١ ورژێمی « تەعین‌و تەرفیع‌کردنی کارمەندان ) ی ژمارە (٢٣)، ساڵی ١٩٧٢ .. لەپاڵ دەیەها بڕیاری شۆرشگێڕانەی سەر بە چینی کرێکارانی عیراق ، لەسەرووی هەمووبانەوەیش دامەزراندنی یەکێتی گشتی کرێکاران‌و دەزگای رۆشنبیری‌ی کرێکاران‌و ئامۆژگاکانی کارو ئابووری لێکۆڵینەوەو پەشق پێکردنی هونەری‌و پیشەیی ، لەپێناوی بنیادنانی



ژیانێکی ئاسوودەی نێو کۆمەڵگەیەکی ئاسوودەی سەر بەنیشتما نێکی ئاسوودەدا .. !

* هەر لەرۆژی تەمەنی شۆرشەوەش تا ئەمرۆ ، بارەگای یەکێتیو نەقابەو لێژنە جۆراوجۆرەکانیان ، بووە بە پۆورەی هەنگو بەکارو داهێنان .. هەر لەو رۆژەوەش ئەم چینە کاریگەرە دەورێکی بنچینەیی وپڕ لەزیندەگی لەکاری گەشەکردنیو بنیادنانا ، نواندووەو بەردەوامیش ئەنوێنێ ..

* لەم رۆژەشدا ، کەگەلی عیراق ، ئاهەنگی جەژنی (١) ئایار ئەگێرێت ، ئەوا ئەو راستییە ئەسەلمێنێ کە : ئەم گەلو سەرکردایەتییە دلێرەی ئێمە ، شانبەشانی هەموو گەلانی جیهان ، هەوڵ ئەدات ، لەکۆتو پێوەندی هەموو جۆرە ئیمپریالیزمو چەوساندنەوەو دابەشبوونو داگیرکردنو رەگەزپەرستییەك رزگار بێت ..

بەتایبەتی لەم رۆژانەو لەم بۆنەیەشدا ، کە چینی بەجەرگی کرێکارانی عیراق ، بەشداریەکی هەرەمەزن لەژیانی کۆمەڵایەتیو ئابووری عیراقدا ئەکەنو لەدوو بەرەشدا ئەجەنگن :

١ ــ بەرەی بەرهەمو بەرهەمهێنان
٢ ــ بەرەی نەمریی قادسیەی صدام .

لەهەردوو بەرەکەشدا ، کارمەییو مەردایەتیی خۆیان ئەنوێنن ، نەخوازەللا لەبەرەی جەنگی رزگاریدا ، لەدژی دوژمنی رەگەزپەرستی عەجەمو لەتەماحکارییو دەستێوەردانەکانی ئەو دوژمنە گەلحۆو کۆنەخوازەدا ، لەپێناوی پێخۆرکردنی بەرەکانی جەنگ بەخوێنی پاكو بەتوانای بەهێزو بەگیانی لەخۆبوردنی تازەی کرێکاران ، تا ئەو رۆژەی ئەو دوژمنە ئەژنۆ دائەداو مل بۆ مافی رەوای گەلی عیراقو پەیامی شەهیدانی رزگاری کەچ ئەکات ..

* پیرۆز بێت (١) ئایار ، جەژنی کرێکارانی جیهانو تێکۆشانی مرۆڤی ستەمدیدەی هەموو جیهان ..

* سلاو لەخەباتی بێووچانی چینی کرێکارانی عیراق ..

* سلاو لەجەنگی رزگاری ، جەنگی قادسیەی صدام ..

* سلاو لەسەرۆکی فەرماندە صدام حسینی تێکۆشەر ..

« رۆشنبیریی نوێ »



# خومەینی ئێران بەرەوچی هەڵدێریك ئەبات

له داستانێکی ترو لـه بوارێکـی گەورەی ترا ، جارێکی که رۆڵـەی بەرجەرگو جەنگاوەری عیـراق هاته مەیدانو لاپەڕەی داستانێکـی کەی به خوێنی ئاڵـــی خـۆی نووسیەوەو بوارەکانـــی بـەرەی جەنگی کرد به گۆڕەپانی سەرکەوتنی پەی دەرپەیی خـۆیو ئەوەیشـی دوپاتکردەوە ، که تا دەس له مـل مافو ئامانجەکانی خۆی نـەکات ، واز ناهێنێو دەس له مافەکانی خۆی هەڵناگرێ ..

عیراقی نوێی ئەمڕۆ ، که خۆی به چەکی بڕواوخواستی مەردانەوە شەتەکداوەو باوەڕێکی پتەویشـی بەرۆژێ سەرکەوتنی یەکجارەکـی خۆی هەیە ؛ هیچ هێزی لـەم دنیایەدا نیه ، له گورو تاوی ئـەو بڕواو خواستەی بخات ؛ چونکـە رۆڵـەی مێژوویەکـی بەهادارو شارستانیەتێکی قووڵو شکـۆدارو قاڵبووی نێو تەجرەبەی خەباتێکـی بێووچانـەو سەرکردایەتیەکـی دووربینو کارامـەیش رابەریی ئەکـات ..

* عیراقی نوێی ئەمڕۆ ، بـە ئادەمزادو خاكو خواستەوە نزیکەی چواردە ساڵە ، شـان ئەکوتێو ژیانێکی نوێ بنیادئەنێو وێڵی دوای ئـازادیو سەربەخۆیی‌یەو زادەی گیانی شۆڕشێکی رەسەنە وجلەوی



رەوتی کاروانەکەیشی بەدەس سەرۆکێکی بەجەرگو وەفادارو دنیادیدەیە ، کە لە کەسایەتی سەرۆك صداما خۆی نواندوە .، رەوشتاو هەڵسوکەوتو نەسرەوتنی ئەم سەرۆکەیش بووە بە سەرچاوەی کارو تێکۆشانی بەردەوامی ، چ لە رۆژانی ئاشتیا ، چ لە رۆژگارانی جەنگا ..

* سەرکەوتنی ئەم دوایی یەی عیراقیش لە جەنگی ڕەواو عادیلانەی خۆیدا لە دژی دوژمنە شەڕخوازەکانی عەجەم ، وا نیە لەو بڕواو گیانو خواستو تەجرەبەو خەباتە دابڕێت ، بەڵکو سەرەنجامێکی ئەو دیاردەو ڕاستی یەیە .. هەر بۆیەشە ، بەم هەموو لەخۆبوردنو گیانی فیداکاری یەوە ، رووی لە بەخشش کردوە .. هەر بۆیەشە ئەم حاڵەتە تازەیەی پێوەندی مرۆڤانەی ئادەمیزادی عیراقی ، روو لە گشت دەنگێکی ئاشتیخوازانە ئەنێو بە هاواری هەر هەوڵێکی دلسۆزانەوە دێت ، بێ ئەوەی هیچ جۆرە هەلو مەرجێك بەسەر عەجەمی بەزیوا بسەپێنێ ..

* بەدەنگەوەهاتنی عیراقی سەرفرازو سەرکەوتوو ، بۆ هەموو کارێکی برایانەو کۆششێکی خێرخوازانەی چارەسەرکردنی کێشەی نێوان عیراقو ئێران ، هەمیشە هەر لەباری سەرنجێکی مرۆڤانەو مەوزوعیانەوە بووەو بەشایەدی هەموو لایەنەکانیش تۆزکاڵێ چیە ، لە گیانی خێرخوازانە لاینەداوە ، مەگەر تەنیا داوای مافە رەواکانی خۆی نەبێت ...

* کەچی بەپێچەوانەی ئەم هەڵوێستە پڕ لە شانازیو شایستەیەی عیراقو سەرکردایەتی دلێری عیراقو دوای ئەوەی ، دوژمنی رەگەزپەرستی عەجەم تا بینەقاقای لەنێو قوڕو لیتاوی جەنگا چۆتە خوارەوەو رۆژ نیە نووچ نەخواتو رۆنەچێتو بەشێکی باش لە نێروەکانی کەلەلا نەبێت ، کەچی بەوپەڕی گەلۆریو کەللەرەقیو رقوکینەوە ، بەوپەڕی کۆنە حەساسیەتەکانی یەوە ، هێشتا هەر رەوتی هەڵوێستی دوژمنکارانەی نەگۆڕیوەو لە کەلی «شەیتانی بزورگ !» نەهاتۆتە خوارەوە ، وەك نە بای دیبێ نە بۆران ، وەك هەزاران هەزار رۆڵەی سادەو دڵپاکی گەلانی کوردو عەردبو بلوچ وتاتو تالشی بەکوشت نەدابێ ، وەك هەزاراز, هەزار تێکۆشەری ئەو گەلانەی لەنێو «بەندیخانەی ئیڤین» توند نەکردبێ ، وەك ملێونەها کەسی دەربەدەر نەکردبێ ، وەك نەبووبێتە شمڵی شەڕی سەر ڕێگەی رزگاری هەمیشەیی ئەو گەلە نەبەردانەو مافو چارەنووسی نەتەوایەتی ئەو گەلە جەزرەبەدراوانە ..

بەڵێ : هێشتا ئەم رژێمە هەلاهەلا بووە ، وا ئەزانێ «مەلیك ـ شا !» ماوەو هێشتا وائەزانێ گەلانی سەرجەمی دنیا ، باوەڕ بە کەڕەناو بالۆرەی ناسازی ئەوان ئەکەن .. «شاخومەبنی»یش وائەزانێ بەم هەڵوێستەی گوایە گرەو ئەباتەوەو ئەتوانێ قەدەم لەسەر شەقامەکانی «بەغدا»دا لێبدات . !

* بێگومان دوژمنێکی رەزاقورسو چەپەڵو کەللەرەقی ئاوا ، کە دێو مەرجی مرۆڤانەی عیراقی سەرکەوتوو ردتئەکاتەوە ، پێویستە دەرسێکی چاکتری پێ بدرێتو پێویستیشە ئارامی لێ هەڵبگرێتو جێگەی پێ لەقو لێژ بکرێتو بە دەستێکی پۆلاینەوە شەپازللەی عیراقو هەموو گەلانی سەر رووی زەوی لە بناگوێ بکەوێ ، ئێ بەلکو ئەمە خوایە «گەر بڕوایان بە خوا هەبێ یا مابێ !» لە خەونی شاتو پاتی خۆیان بێداربینەوەو واز لە تەلەکەبازیو هەڵخەڵەتاندنی گەلانی موسوڵمانو لەوانەیش گەلانی ئێران بێننو دێوجامەی ساختەی «ئاین بازی !» داکەننو رووبکەنە سەر شەقامی رووناکیو واز لە تونێڵە تاریکەکانی خۆیان بێنن.

* بێگومانیش ئێمە لەو باوەڕەداین ، کە سەرکەوتنە ئاشکراو روونەکانی سوپای بەجەرگی عیراق لەم شەڕەی دوایی‌دا ، لە داستانی شۆشو دیسفول‌دا ، ئەومەلاملهوڕانەی کە لە گۆێی گادا خەوتوون بێدارئەکاتەوەو چارەنووسی رەشیان دەس‌نیشان ئەکان ..

چونکە بەتەواوی کاسەکە لێوڕێژ بووەو هەندەی نەماوە ببێ بە لێشاوی تۆفانێکی گەورە .. !

* سلاو لە شاسواری قارەمان صدام حسین

* سلاو لە سوپای دلێرو بازووی پۆلاین .

* سلاو لە گیانی پاکی شەهیدانی رێگەتی پەیامی مرۆڤو ئازادی دادو یەکسانیو ئاشتی .

# بۆچی عیراق یەکەم ئامانجی چاودابڕینو پەلاماری فارسەکانە

له سەرانسەری مێژووی دەستدرێژیی عەجەم له نیشتمانی عەرەبدا دەردەکەوێ کە سەرشاری ئامانجی ئەو دەستدرێژی‌یە عیراق بووە ، چونکە عیراق به کلیلی دەروازەی رۆژهەڵاتی نیشتمانی عەرەب دادەنرێت ، جا هەر نوشوستی‌یەك له توانای عیراقدا مانای بوار بۆ هەڵکەوتنی هەڵکوتانەسەر نیشتمانی عەرەب‌بووە . بڕوانە ئەو چوار سەدەیەی رابردوو که له سالی (١٥٠٨)ەوە دەست‌پێ‌دەکات دەبینن له دەولەتی سەفەوی‌یەکانەوە تا ئەمڕۆ پەلاماریان هەر بەردەوام بووەو هەر نەپساوەتەوە .

چاودابڕینو نیازی شەڕانەیان‌کەم‌و زۆرو بەرزو نزمی‌یەکەشی پەیوەندی بە هێزو دەسەلاتی عیراقەوە هەبووە ؛ هەر کاتێك سەیریان کردبێت عیراق لاوازە کەلبەی خۆیان بۆ داپاچینی دەرهێناوە ، بەلام کە زانیبێتیان بەهێزە خۆیان له قەرە نەداوە .. ئیتر لەوساوە کە عیراق لەژێر سێبەری داگیرکەرانی عوسمانی‌دا بووە ئەم هەوڵو تەقەلایە پاش‌و پێشی کردووە .

ستراتیژێ دوژمنانەی فارس بریتی‌یە لەوە ئەگەر هاتوو عیراق داگیربکەن‌و گەلەکەی بچەوسێننەوە مانای وایە دەرگایان بۆ دەکرێتەوە سەر گزی پشتێ تا لەوێوە شالاو بۆ سەر نیشتمانی عەرەب‌و بەتایبەتی کەنداوی عەرەب بهێنن‌و دەست‌کەن بە ئازاردانی عەرەب‌و لێی‌نەگەڕێن رێگەی یەکیەتی‌و سەربەستی‌و پێشکەوتن بگرێتەبەر . ئەم جۆرە تەقەلای دەستدرێژیانەش چەند شێوەیەکی وەرگرتووە ، لەوانە شەڕفرۆشتن بە سنووری رۆژهەلانی نیشتمانی عەرەبی ، هەروەها هەڕەشەی داگیرکردن‌و زەوت‌کردنی هەندێ هەرێم ، لەگەل دەست‌خستنە ناو کاروباری ناوخۆی ناوچەکەوە . ئەم گیانی ئیستیعمارگەری‌یەش لە سەردەمی شادا زیاتر هەلکشا کاتێك خەوی بە دروست‌کردنی ئیمپراتوریەتێکی وەکو ئیمپراتوری‌یە مەجوسی‌یەکەی (کۆرش)ەوە ئەبینی .

عیراق لەسایەی شۆرشی مەزنی تەمووزدا توانی لفاوێك نبێتە دەمی تەماعکاریی فارسەوە ، کاتێ کە شۆرشی بەعس هێزوگوڕی وەبەر عیراقدا هێنایەوەو عیراقی کرد بە هێزێکی ئەوتۆ کە دوژمن هەزار حیسابی بۆ بکات ، عیراقێك بقوانێ خۆی‌و کەنداوی عەرەب لە تەماعی شاهەنشا بپارێزێت .

ئەوە‌بوو پاش شا رژێمی خومەینی هات ، کە بە بیرو مێشکێکی رەگەزپەرستی دڕندانەترو لەژێر پەردەی ئیسلامدا ویستی شۆرشی بەناو ئیسلام بەرەو نەتەوەی عەرەب‌و نەتەوە موسلمانەکان پاڵ‌بنێوەبنێ . کاکڵی ئەو هەناردە خومەینی‌یەش بریتی‌یە لە داگیرکردنی خاکی نەتەوەی عەرەب لەژێر پەردەی ئیسلام‌و دەولەتی ئیسلامدا ، ئەمەش هەوڵێکی تازەی شعوبییانەیە بەنیازی تواندنەوەی نەتەوەی عەرەب‌و تەگەرە خستنە ڕێی راپەرین‌و کاری گەورەی عەرەبە بۆ پاراستنی ئیسلام .

ئامانجی هەرەگەورەی ئەو تەقەللا دوژمنانەیەی بە پەردەی ئیسلام داپۆشراوە ئەوەیە رەمزو بنەڕەتی راپەرینی عەرەب لەناوبەرێت کە بریتی‌یە لە شۆرشی بەعسی عیراق‌و رێبازی نەتەوەیی سوشیالستی . کەوای ای‌هات عیراق بووە مایەی مەترسیی رژێمی فارسی چونکە لەوە گەیشت هەتا سەنگەری رۆژهەلاتی نیشتمانی عەرەب تێك نەشکێنێت کە عیراقە ناتوانێت (شۆرشەکەی !) بنێرێتە دەرێ‌و بچێتە ناو هەرێمانی کەنداوی عەرەب‌و بیان‌خاتە ژێردەستی خۆی .

مەودای جیوپولتیکی‌ی تەماعکاریی فارس لە بواری سروشتدا لەوەدا دەردەکەوێ کە دەیەوێ دەست بەسەر خێرو سامانی کشتوکاڵی‌و کانەکانی عیراقدا بگرێت ، پاشان دەست‌بەسەر کانیاوە نەوتە زۆرەکانی ناوچەی کەنداوی عەرەبدا بگرێت ، دوا ئەنجامەکەش برسی‌کردن‌و چەوساندنەوەو ژێردەست‌کردنی گەلی عەرەب بێت . هەستی رەگەزپەرستانەی فارسی‌و ئاواتی ژێردەست‌کردنی نەتەوەی عەرەبی بەوە قووڵتر بوو کە عیراق رێبازی نەتەوەیی ئیشتیراکی گرتوەتەبەر هەر بۆیەش



فارسەکان کەوتوونەتە کار بۆ نەهێشتنی ئەو ڕێبازە، چونکە عیراقی نەتەوەپەروەر کە داوای یەکیەتی و سەربەخۆیی و سەربەستی عەرەب دەکات دەیەوێ لە مەیدانی گێشەو زۆرانبازیٔ نێودەوڵەتان بەدوور بێت و هەوڵدەدا بەهێز بێت و بۆئەوەی سەرلەنوێ مێژووی بەرزی عەرەبی بگێڕێتەوەو دەوڵەتی عەرەبی لەنێوان نەتەوەکاندا پایەیەکی شیاوی هەبێت و سەرلەنوێ بەخششی تیری خۆی بە مرۆڤایەتی بداتەوەو لە شارستانێتی سەردەمی نوێدا بەشداری بکات .. ئیتر هەموو ئەمانە فارسەکان لێی دەترسن. ئەمەو چونکە شۆرشی بەعس کە ڕەگی قوولی لە جەستەی نەتەوەو خاکی عەرەبیدا داکوتاوەر هەوڵدەدا گیانی بێهیوایی و قنیاتکردن نەهێلێت و کۆمەڵی نوێ بنیاتبنێ ئاواتی دوژمنانەیان پووچدەکاتەوە کە هەوڵدەدەن جەستەی نەتەوە پارچەبکەن . هەر لەبەر ئەوەیە پڕکێشانە سەری خۆیان هەلگرت و هەلیانکوتایە سەر عیراق .

دوژمنانی نەتەوەی عەرەب لە ئیمپریالزم و زایۆنیزم و لە ناپاکەکانی عەرەب خۆی دلیان بەم دەستدرێژییەی فارسە ڕەزگەزپەرستانە خۆشکرد، بەلام دەستیان لەسەر ئەسپێکی دۆڕاو دانا کە هەر لە چەند ڕۆژێ سەرەتاوە گلیداو کەوت . ئەوانیش و فارسە ڕەگەزپەرستەکان نەیانزانی یان خۆیان لێ نەزانکرد کە ئەم جارە ئەوەی بەرەنگاری بوون عیراقێکی نوێیە ، عیراقێکی بەهێزی جۆشدراووی سەرکرادایەتییە زیرەکەیەتی ، ئەم جارە ڕووبەڕووی گەلێکن گەلی مەزنی عیراق کە ڕەگی بەجۆرێك لە خاکەکەی چەسپیوە ئامادەیە بە خوێن و بە گیانی بە سەروسامان فیداکاری بکات تا هەموو داخوازییە نیشتمانی و نەتەوەییەکانمان لە مافی زەوی و ئاودا دێنەدی .

دوژمنانی عیراق و نەتەوەی عەرەب کە لە پشت ڕژێمی خومەینی وەستاون لەوە دڵنیان کە ئەگەر بتوانن هێزی سەربەرزیی نەتەوەی عەرەب کە لە بەغداوە سەریهەلداوە لەناوبەرن مانای وایە ئەوسا دەتوانن جەستەی عەرەب تووشی دەردو شکستی بکەن .. ئیتر ڕێگەیان لەبەردەمدا تەختدەبێت کە تەماعکاریی خۆیان لە ناوچەکە بهێننەدی . بۆیە ڕژێمی خومەینی کە تاماعی لە مێژینە پالیپێوەدەنێت دەیزانی عیراق لەچاو نەتەوەی عەرەبدا چ دەورێك دەگێڕێت و لەوە گەیشتووە هەتا عیراق قەلایەکی سەخت و دژ بە دوژمن وەستابێت هیواکانی لە ناوچەی کەنداودا بە ئەنجام ناگەن ، لەبەر ئەوەیە عیراق سەرشاری ئامانجی دوژمنداری و دەستدرێژیی فارسەکانە .

بەلام هیوایان ڕووخا هەروەکو هیوای ئەو کەسانەش ڕووخا کە پشتی ڕژێمی خومەینی دەگرن ، نەك ئەوە بەلکو دیواری شوڕای ڕۆژهەلاتی نەتەوەی عەرەب تا دێ پتەوترو بەتینتر دەبێت و ڕۆژبەڕۆژ داروودەستەی ڕژێمی خومەینی لەوە دەگەن، کە ڕێگای خەونی پەلهاویشتنیان بە هەزاران تەگەرەو کۆسپ تەتراوەو عیراقیش قەلای قایم و توللەی پتەوی نەتەوەی عەرەبە .

# بۆ بەرژەوەندی کێ ڕژێمی سووریا بەرگری لەڕژێمی خومەینی دەکات

هەر لەو ڕۆژەوە کە حوکمڕانانی تاران شەڕە دوژمنداریێتی‌یەکان بەسەر عیراقدا سەپاند ؛ هەریمێ ئوردنی برا هەڵویستێکی نەتەوەیی ئازاو سەربەرزو ڕوونی بەرامبەر بە عیراق نواند .. سیاسەتەکەی ئاشکرا ڕاگەیاند سەبارەت بە وەستانی لەتەك مافی عیراق‌و عەرەب لە ڕزگارکردنی خاك‌و ئاوی نە «زین القوس» و «سیف سعد» و کەنداوی عەرەبدا .. وە دانانی سنورێك بۆ ڕق‌وکینەی فارسیەت‌و ئاراستەکراوەکانی دەستەی خومەینی لە دەست‌خستنە ناو کاروباری ناوخۆیی عیراق‌و هەرتبمانی کەنداوی عەرەبیەوە .

هەروەها لەسەرەتاوە ، هەندێ ڕژێمی عەرەبی وەك تەماشاکەر وەستان سەرەڕای جیاوازیی پاڵدانیان بۆ نواندنی ئەم هەڵویستە .. هەبوو دەیوویست ؛ ئێستاش دەیەوێ ؛ کە عیراق بەزێت بۆئەوەی ئیتر مەشخەڵەکەی بەردەوام نەبێ بۆ خولقاندنی کارتێکردنی ئیجابی خەباتی نەتەوایەتی بۆ دابین‌کردنی ڕزگاربوون‌و یەکێتی . وە بۆئەوەی تاقیکردنەوەی عیراق ، کە شۆڕشی ١٧ ی تەمموز بە سەرکردایەتی پارتی بەعسی سۆشیالستی عەرەب بنچینە نەتەوەیی‌یەکانی داکووتا ، داپۆشرێت . وە هەبوون لە دوورەوە بێ‌دەنگ دەستیان خستبووە ئەژنۆیانەوە بەوەی کە ئێران تا پێش شەڕەکە «پێنجەمین سووپا» بوو لە جیهاندا !

لەتەك ئەم هەڵوێستانەشدا ، هەندێ ڕژێمی (عەرەبی) بە ووتەو کردەوە لەتەك دوژمنی نەفام‌و ڕەگەزپەرست وەستان بێ‌ئەوەی شەرم‌بکەن یان تۆزێك حەیایان هەبێت .. لە پێشەکی ئەم ڕژێمانەش ڕژێمی «حافظ اسد» بوو کە تەنیابە تاودانی دەستەی خومەینی بۆ سەپاندنی شەڕ بەسەر عیراقدا نەوەستا بەڵکو گشت جۆرە یارمەتییێکی تەکنیکی‌و عەسکەری‌و ڕاگەیاندنیشی خستە بەردەستیانەوە .. وە هەموو جۆرە زانیارییێکی پێشکەش کردن گوایە حوکمڕانانی تاران کەڵکی لێ وەردەگردن‌و بەشکە مەعنەویاتیان بەرزدەبێتەوە .

بیانووی ڕژێمی «حافظ اسد» لە گرتنەبەری سیاسەتێکی دژ بـــە ویستی‌یەکانی عـــەرەب لــــە سەربەخۆیی‌و رزگاربـــوون‌و دژی پەیڕەوی هاوکاریـــی عـــــەرەب ، ئەوەیە گوایە هەڵگیرساندنی شـــەڕ لەنێـــــوان عیـــــــراق‌و ئێران، بەرەنگاربوونی عـــەرەب دژ بـــــە زایۆنیزمی رەگەزپەرست بێ‌هێـــز دەکات‌و توانـــاو هەوڵدان بــــــۆ رزگارکردنی خاکـــــی فەلەستینی داگیرکراو پەرت‌دەبێت .. نـــەك تەنیا ئەم بۆچوونە کە «حافظ اسد» بە بیانووەوە دەیجووێتەوە بەڵکـــو نەفامی گەیشتە رادەیەك بڵــێ کــە شەیرەکـــە «ووزەو توانـــستەکانی شۆڕشـــی ئیسلامـــی ئێران بـــۆ بەرگری‌کردن لــــە فەلەستیــــن‌و مەسەلەکانی عەرەب دووادەخات» !

کێ ئەم قســە حەلەق‌و مەلەقانەی دەچێتە گوێ ؟ .. وە پەیـــوەندی ئێران ، لە سەردەمی شا بێ یـــان خومەینـــی ، بــــــە فەلەستین‌و مەسەلەکانی عەرەبەوە چی‌یە ؟؟

ئاشکرایە کە ئێران لە سەردەمی شادا چ دەورێکی لــە وولاتانـــی کەنداوی عەرەبدا دەگێـــڕا .. وە بەردەوام دەستی لــــە کاروبـــاری ناوخــــۆیـــی‌یـــان وەردەدا ... پەیوەندییەکانی لەگەڵ زایۆنیزمـــی دوژمن ئاشکراو بەهێزبـــوو .. وە هیـــچ کاتێـــــك رووی ئـــــــەم پەیوەندی‌یانەی نەدەشاردەوە ، کــە لە سەرەتاوە رژێمی خومەینـــــی هەوڵی دەدا پەیوەندییەکان ئێـــران لەگەڵ زایۆنیزم‌دا لـــــە سەردەمە ڕەشەکەی خۆیدا بشارێتەوە .

ئەوەیـــە پەیڕەوی ئێرانی شـــا لەگەڵ عەرەب‌و مەسەلەکانیانەوە .. جا هەڵس‌وکەوت‌و پەیڕەوی ئێـــران شا لەگەڵ‌ئێران خومەینی بەرامبەر بە عەرەب بـــە شێوەیەکی گشـــتی‌و عیـــراق‌و کەنـــداوی عـــەرەب‌و مەسەلەی فەلەستین بەتایبەتی ، چ جیاوازێیکی هەیە تا رژێمی سووریا رێگا بەخۆی بدات لەوەی بـــەرگری لــــە خومەینـــی‌و داروودەستەکەی بکـــات .. وە دژی هەڵوێستـــی دلێرانەی ئـــــوردن بووەســــتێ سەباردت بـــــە دەرگاکردنەوە بـــۆ جەماوەری عـــەرەب لــــە ئـــوردن بۆئەوەی بەشداری لە شـــــــەڕی راستەقینەی عیراق، بکــــەن دژی رژێمی خرمەینـــــی‌و ئیمپریالیزم‌و زایۆنستە هاوپەیمانەکانی خومەینی .. و .. بەکارێکی وای دادەنێ گوایە: «ئابڕووو هەڵـــوێســتی ئــــوردن دەشێوێنێ هەروەك چۆن هــــــی شۆڕشـــــــی ئیســـــلامی ئێران دەشێوێنێ» ! وە چۆن رژێمـــــی «حافظ» شــــــەڕی راستەقینەی عیراق دژی عەجەمە رووڕەشەکان بە «شەڕێکی پەراوێز دادەنێ کـــە دەبێتە تێکـــــدان‌و لەریزەوەچوونی عەردب ! » .

خومەینی ، هەر لە یەکەم رۆژی وەرگرتنی جلـــــەوی حوکمی‌یەوە لەسەر هەمـــان رێبـــازی شــــا رۆیشتووەو هەمـــان ریـسیشــە دەیپەستێتەوە سەبـاردت بــــــە پەیوەندیـــــە دوژمنداریتی‌یەکانی لەگەڵ عەردب‌و هـــەمان نەخشـــەشە راپێشی دەکات کە شا کێشابووی بۆ دامەزراندنـــی «ئیمپراتۆریەت»ێکی فارسی .. نەك ئەمەو بەس ، بەلکو





گەوجێتی گەیشتە رادەیەك بڵێ بەحرێن پارێزگایێکی ئێرانییەو بەغداو عەدەنو هەرێمانی کەنداو «فارسی»ین !

کوا هەڵوێستی لایەنگیرانەی ئێران بەرامبەر بە مافو هەقی عەرەب هەروەك «حافظ اسد» بۆی دەچێت ؟؟ ئایا ئەمە لە پەیوەندیی چەکداریی ئیرانی ـ زایۆنی دایە کە هەردوولا دانیان پێ‌ی داناوە ؟ یان لەو دەستدرێژی‌یە دایە کە کردنە سەر کوێت ؟ یان لە پیلانەکەی دژی بەحرێن ؟؟ یان لە دەستخستنە ناو کاروباری ناوخۆیی وولاتانی عەرەب ، هەروەك لە کۆماری یەمەنی باکوورو «قطر»دا روویدا ؟؟ ..

رژێمی «حافظ اسد» کە دژی بزووتنەوەی نیشتمانی‌ی لوبنانو بەرهەڵستی فەلەستین لە لوبناندا رادەوەستێو قۆڵو بازوودی پیشاندەدات ؛ بۆچ بەرامبەر بە بریاری زایۆنی دوژمن سەبارەت بە داگیرکردنی (جۆلان) گەوجو سەرشۆڕانە دەوەستێ ؟؟

بۆچی دەنگی ناڕەزایی دژی ئوردن بەرز دەکاتەوە ، کەچی دەستەوەستەو بێ دەنگیی بەرامبە بەم بریاردی زایۆنی رووڕەش دەنوێنێ ؟ !

ئایا راستە «حافظ اسد» سوورە لەسەر یەکێتی‌ی عەرەبو بەهێزبوونی توانایی عەرەب بۆ بەرەنگاربوونی قەواردی زایۆنیستی دوژمن ؟ .

ئەگەر وایە ، کوا دەورەکەی لە هەردوو کۆنگرەی بالآی (عمان)و (فاس)دا لەو کاتەی لە کۆنگرەی یەکەم چووە دەرەوەو وەفدێکی «بەسەرکردنەوە» شی بۆ کۆنگرەی دووەم ناردو بەم هەڵوێستە نانەتەوەیی‌یەی هەوڵی کزبوونی هاوکاریی‌و کاری هاوبەشیی عەرەبی دا .

گشت ئەم هەڵوێستانەن حوکمڕانانی «دمشق» ، رێڕەوێکی نەگۆڕاویی رژێمی سووریا پێکدێنن کە لە میانیەوە ، بەرێگای خواروخێچەوە ، لە ئیلتزامە نەتەوەیی‌یەکان لادەدەنو بە هەزاران فێڵو بیانوو خۆیان لە ئەرکەکانی نەتەوایەتی دەشارنەوە ..

بەڵام تاونبارو سەرشۆڕو زەین‌کوێر هەرچەند زۆڕەو بن ، تەمەنیان کورتە ...

ئەم بارە خۆی لە خۆیدا ، بەسە بۆ دەست ـ نیشانکردنی دۆخی رامیاریی نالەبار لە ئێراندا . ئەم حاڵەتەیە ، کە رژێم بەینا بەین بە گۆڕینیان ، گەر زیندوو بن یا دەرحاڵ دوای کوشتنیان بە دەستی لایەنە ناو خۆیی‌یەکانی دژی رژێم ، دایدەپۆشێت . هەمان شتیش لەناو سوپادا روو دەدات . سەرکردەکانی سوپا ، لە وەزیری بەرگری‌یەوە بگرە ، کە سێ جار گۆڕدرا ، تا دەگاتە سەرەك فرقەو لیواو وەحداتی تری عەسکەری ، بەردەوام دەگۆڕێن‌و لادەبردرێن .

ئەودی سەرنج رادەکێشێت

دانانی «حسین موسوی» یە ، کە یارێیکی تری نوێی رژێمە ، لە پەنای «سەلماندنی دیموکراتیەتەوە»، وە لە ئاکامی ئەوەی کە «علی اکبر ولایتی» ، پالێوزاوی «خامئنی» بۆ سەرۆکایەتی وەزیران ، نەیتوانی دەنگی تەواو وەربگرێ بۆ ئەوەی لە «ئەنجومەنی شورا» سەرکەوێ .. دیسانەوە «حسین موسوی» خۆی کە نەیتوانی زۆربەی دەنگەکان وەربگرێ .
رژێمەکە ئەم حاڵەتەی داوەتە پەنای «سەلماندنی دیموکراتیەت» ، سەرەڕای ئەوەی کە بارو دۆخەکە وا نی‌یەو حاڵەتێکی کێشەو ئاژاوەو ناکۆکی‌و دژایەتی‌یە . گەر وا نەبێ ، ئەی بۆچی بەر لە ئێستاوە ئەم رژێمە «شێوازی دیموکراتیەتی» بەکار نەدەهێنا ؟ ! .
تاقیکردنەوەی سەرنەکەوتنی «اکبر ولایتی» ، بەڵگەی هەرە روون‌و دیاری هەبوونی کێشەو ناکۆکی‌یە لە نێوان «هاشم رفسنجانی» سەرۆکی «ئەنجومەنی شورا» و «علی خامئنی» سەرۆکی کۆمار . «رفسنجانی» رازی نەبوو کە ناوی «اکبر ولایتی» دابنرێت ، کەچی «خامئنی» خۆی داوای پالێوتن و هەڵبژاردنی کرد ... جا هەڵبەتە «رفسنجانی» کەسوکاری خۆی لە ئەنجومەن هان دەدات کە دەنگ دژی «ولایتی» بدەن . بەمجۆرە «رفسنجانی» کەوت‌و دەرنەچوو .
ئەودی لە نێوان سەرکردەکانی رژێم روو دەدات، هەمان شتیش لە نێوان سوپاو پاسەوانانی خومەینی، کە لەم دوایەدا گەیشتە رادەیەك کە زیاتر دژی یەکترەوە رابوەستن‌و یەکتر بکوژن . وە خومەینی بۆ ئەوەی هەردوو لا ئاشت بکاتەوە ، هیچی پێ نەما جگە لەوە نەبێ پەنا بەرێتە بەر «منتظری» و داوای کۆبوونەوەیەکی هاوبە بکات کە اسەرکردەکانی

# هەڵوێستی رژێمی خومەینی دەربارەی زانست و زانیاری یەوە



**بەش‌و کاروکردەوەی سەرۆکایەتی وەزیران‌و سەرۆکایەتی کۆمار لە ئێراندا لە یەکترەوە جیا نیین . «خامئنی» سێیەمین سەرۆکی کۆمارە دوای «ابو الحسن بنی صدر» ، کە ئێستا لە دەرەوەی ئێران «لە پاریس»ەو «رجائی» کە پاش ماوەیەکی کەم دوای وەرگرتنی جڵەوی حوکم بە سووتان سەری نایەوە .**

پاسەوانانی شۆڕش‌و دەستەی ئەرکانی سوپا) بەشداری تێدا بکەن . بەلام ئێستاش لەگەل دابێ «منتظری» هیچ راپۆرتی لەمەڕ ئەم ئەرکەیەوە بە خومەینی نەداوە .

بەلگەیەکی تر : ناکۆکی نێوان «خامنئی» و «رفسنجانی» ناکۆکی‌یەکی دژوار لە ریزەکانی حزبی کۆماریی حوکمدار دەگەیەنێ ، چونکە «خامنئی» و «رفسنجانی» هەردووکیان دوو سەرکردەن لەم حزبەدا . بەم جۆرەش ؛ هەلبژاردن بۆ پایەی سەرەك وەزیران ئەبێ بە بڕیاری حزب بێ‌و گفتوگۆی لەسەرا نەبێ . بەلام ، چونکە ناکۆکی روویداوەو هەیە ؛ ئەمە مانای کێشەو ناکۆکی‌ی قوول‌و سەرەکی لەناو حزبدا ئەگەیەنێ ، کە بووە هۆی ئەوەی بۆ پالێوتنی یەکێك بۆ ئەم پایە رێك نەکەون .

هەر لەو رۆژەوە کە رژێمی خومەینی جلەوی حوکمی گرتووەتە دەست لە ئێرانا ، بە چاوێکی سووکەوە هەلس‌و کەوت لەگەل رۆشنبیرو رۆشنبیران‌و زانست‌و زانیاری دەکات .

سەبارەت بە کەرتی زانست‌و زانیاری‌یەوە ، بە دەستەو دەزگا جۆراو جۆرەکانی‌یەوە ، سەرچاوەی پێشەکی‌ی ئەو هەلوێستە دوژمنداریتی‌یەی کە رژێمی خومەینی بەرامبەری نواندووە ، لەپاشان سەرچاوەی یەکەمین لێدانی ــ شاراوە ـی کە بۆ مەبەستی کزبوون‌و بێ‌هێز بوونیەوە ئاراستەی کردووە ، لەوەوە دایە چونکە دەزگاکانی زانستی ــ بە تایبەتی زانکۆکان ــ کۆلەکەی سەرەکی بوون کە دژی رژێمی شا وەستان‌و ، بۆ ماوەی پانزە سالی بەر لەناوچوونی‌دا ، دلە خورپەیان خستە ناو رژێمەکەوە . وە چونکە کەرتی رۆشنبیران لە ئێراندا (ئەوانەی سەر بەم دەزگایانەن لە مامۆستاو قوتابیدا..) هێزێکی سەرەکی بووە کە بۆ رووخاندنی شاوە هەولی داوەو ، زۆر بە ڕشتیشەوە بەشداری بەرپاکردنی شۆڕشی میللی دژی رژێمی شای کردووە .

لەژێر رۆشنایی هەلوێستەکانی ئەم کەرتەوە ، رژێمی خومەینی ، هەر لە یەکەم رۆژی حوکمگێرانی ــ بەرەو دژی رۆشنبیرو رۆشنبیران وەستاوەو دەوەستێ . ئەوە بوو ، هەر لەو کاتەی کە رژێمی شا رووخاو دەستەی خومەینی هاتە سەر حوکم ، روو بەرووی مامۆستاو قوتابیانی زانکۆو قوتابخانەکان بوو . ئەم بەرەنگاربوونە زوو بە زووەش دوو هەلوێستە رەچاو دەخات .

یەکەمیان : هەلوێستی کۆنەپەرستی‌ی خومەینی‌و دارو دەستەکەیەتی .

دووەمیشیان : بۆ پەیڕەوو بیرو باوەڕی دژاو دژو یەکنەگرتوویی نێوان تاقمی خومەینی‌و ئاوات‌و خواستی گەلانی ئێران دەگەڕێتەوە ، کە کەرتی رۆشنبیران کۆلەکەی سەرەکی‌و بەهێزیەتی . بەم جۆرەوە رژێمی خومەینی ، پێش ئەوەی ناکۆکی لە نێوانیان‌دا بە ئاشکرا پەیدا بێ ، بۆ لێدان‌و لەناوبردنی ئەم کەرتە ، زوو بە زوو ، بەم شێوەی خوارەوە دەستی وەشاند :

یەکەم : هەلمەتی گرتن‌و کوشتن ، کە لە نیوەی یەکەمی سالی «١٩٧٩» ەوە لە ریزی مامۆستاو قوتابیانی زانکۆو قوتابخانەکان دەستی پێکرا ، وە بەو بیانۆیەی گوایە دەیەوێ لە بیرو باوەڕی دژ بە «شۆڕش» و «ئیسلام» پاکیان بکاتەوە !

دووەم : داخستنی دەرگای زانکۆکان‌و راگرتنی خوێندن لە ناوەڕاستی سالی «١٩٧٩» وە ، بەو بیانۆیەی کە گوایە لە لایەن «شەیتان»و «خوانە ــ ناسەکانەوە» بۆ وەستان‌و بلاوکردنەوەی بیرو باوەڕی دژ بە رژێم بەکار دەبرێن . لەپاشان داخستنی دەرگای گشت قوتابخانەکان بە هەمان بیانۆوە « هەر لە دەست پێکردنی دوژمنداریتی‌ی دژی عیراق»ەوە.

سێیەم : دەستکردن بە هەلمەتی راگەیاندن دژی زانست‌و زانیاری ، بەو رەنگەی گوایە بەرهەم‌و شێوازی بە پیت‌و بەرەکەتن بۆ هاتنە ناوەوەی ئیستعمار ! .

چوارەم : ئاراستەکردنی هەلمەتی راگەیاندنی کۆمەلی کە ؛ رژێمی خومەینی هەر لە کاتی گەرم بوونی ناکۆکی لە نێوانی‌و لایەنەکانی دژ بە رژێم جێبەجێ‌ی دەکات ، بۆ زۆربەی زۆری قوتابیانی قوتابخانەو زانکۆکان .

بەم پێیەوە ، بە هیچ جۆرێك ناتوانین ئەوە شی بکەینەوە کەوا بۆچی لەم دواییەدا رژێمی خومەینی دەرگای «هەندێ» قوتابخانەی کردەوە!..
جگە لەوەوە نەبێت ، کە هەنگاوێکی ترە لە بەرنامەکانی رژێم بۆ لێدانی کەرتی زانست‌و رۆشنبیران‌و دەست بەسەراگرتنی . وە بۆ ئەوەی ، بەهۆی نزم‌بوونەوەی پلەی زانست‌و رۆشنبیرییەوە ــ بە گوێرەی ئەو پەیڕەوو پاسایانەی کە دایناوە ــ گوایە دەتوانێ دەوری مەزنی قوتابخانەو دانیشتگاکان لە وەستان‌و بەرەنگاری‌کردنی رژێم کەم‌و بێ‌هێز بکاتەوە ! .

د. عبد الرحمن حاجی معروف

# پێداچوونەوەیەك

— بەشی دووەم —

مامۆستا مەسعوود دوای هێنانەئارای باسی کێشەی هەمزە ، هاتۆتە سەر لێکدانەوەی باسی ڕاستەوخۆی ئەو ڕایەی کە دەنگی پێش (ن)ی چاوگی لە وشەی وەك «کردن»و «ڕستن»دا بە (قورس‌کردن) دادەنێ . پاش هێنانەوەی هەندێ نموونە ( کە زوربەیان ، هەر ئەوانەن کە لە وتارەکانی زوویدا لێیان‌دواوە ) دەڵێ : « من لە نووسینی لێشترە بەپێشەوەی خۆمدا ناوی ئەو بێ‌هێزەم ناوە ( قورس‌کردن — قورسایی ) چونکە نە بزوێنی درێژەو نە کورتە (واتە نە ئەلفەونە واو ؛ نە یێ‌و نە کەسرەو نە فەتحەو نە بۆر ) نە دەشتەوێ بزوێن لەو شوێنەدا بەکاربهێنێت : ناچاربیەکی دەربڕینی دەنگی بێ‌بزوێنە لە حاڵەتی تایبەتیدا ئەم قورس‌کردن لەگەڵ خۆیدا دەهێنێ‌و هەر کە ناچاریەکەش نەما قورساییەکە تێ‌دەچێ » ( ڕۆشنبیری نوێ ، ژ ٨٠ ، ل ٥ ) ... پێشتر ڕوونمان‌کردەوە کە دیاردەی ناوبراو دەنگە نەك قورس‌کردن . ئێستاش دێینە سەر بەندی دووەمی ئەو کێشەیە کە هەندێ جار دیارەو هەندێ جار ونە . بە ڕای ئێمە ئەم هۆی بوون‌و نەبوونی هێز ( النبرە — Stress ) لەسەر ئەو کورتە بزوێنە .

یەکێك لەو کێشە گرنگانەی فۆنەتیکی زمانی کوردی کە هێشتا تیشکی ڕووناکی‌یان نەگەیشتووەتێ ، مەسەلەی هێز ( النبرە — Stress )ە . نەبوونی ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانەش کەلێنێکی گەورەیە لە باسی فۆنەتیکی کوردیداو بووەتە هۆی جیانەکردنەوەو تێکەڵ‌کردنی هەندێ دەنگ ، کە ئەمەش لە ڕێنووسدا ڕەنگی داوەتەوە . بەوێنە زمانەوانانی کورد بە پێوانەی عەرەبی وایان‌داناوە کە لە کوردیشدا دوو بزوێنی (ی) هەیە ، کە یەکێکیان کورتەو ئەوی دی‌یان درێژ — واتە یەکێکیان وەك ژێر (کسرە)و ئەوی تریان وەك (ی) . بۆ جیاکردنەوەشیان دووەمیان بە دوو (ی) نووسیوە ، لە ڕێنووسی کۆڕیشدا لە بریتی دوو (ی) ، (ی — کەشیدەیەك لەسەری ) بەکارهێنراوە .

بە ڕای من ئەمە بەزۆر سەپاندنی فۆنێمی عەرەبییە بەسەر کوردیدا . هەردوو بەرە وای بۆ چوون، کە لەبەرئەوەی لە زمانی کوردیدا (و)ی بزوێنی کورت‌و (وو)ی بزوێنی درێژ هەیەو لە عەرەبیشدا (ضمە)و (و) هەیە ، ئەوە دەبێ (ی)ش هەر بەو چەشنە — واتە کورت‌و درێژ ، وەك عەرەبی (کسرە)و (ی)— بێ . لەڕاستیدا لە زمانی کوردیدا بەوجۆرە نییەو بەداخەوە کۆڕو گەلێ لە زایانان‌و ڕووناکبیرانی کورد هەستیان بەو تایبەتێتی‌یەی زمانی کوردی نەکردووە .

گومان لەوە ناکرێ کە لە زمانی کوردیدا (و — u )و ( وو — û ) دوو فۆنێمن ، چونکە گۆڕینی (و — u ) بە ( وو — û ) جیاوازی دەخاتە نێوان وشەوەو وشەی نوێ پەیدادەکا . بەوێنە ئەگەر لە وشەی «کوڕ»دا فۆنێمی (و — u ) بکرێتە (وو — û ) ، ئەوە وشەکە دەبێتە «کووڕ» ، واتە جیاوازی کەوتە ناوانەوەو لەبەرئەوە دوو فۆنێمن . بێ‌گومان کە دوو فۆنێمی جیاواز بوون ، ئەوە بۆ تێکەڵ نەکردنیان لە ڕێنووسدا پێویستیان بە دوو نیگاری جیاوازە .

هەرچی بزوێنی (ی — î )یە لە زمانی کوردیدا یەك فۆنێمە ، نەك دوو . هەرچەندە هەندێ‌جار کورت‌و هەندێ جار درێژ تەلەفوز دەکرێت ، بەڵام ئەمە دەوری واتاگۆڕی نابینێ . جا کە دەوری واتاگۆڕی نەبینێ ، ئەوە فۆنێمی‌تر ناهێنێتە کایەوە . کە فۆنێمی‌تریش نەبوو ئیتر پێویست بە نیگاری‌تر ناکات . لە دەیان وشەی وەك «بیر ، تیر ، شیر ، پیر ، میر ، سیر ، هەنجیر ، پەنیر ... » ، کە بزوێنی (ی) درێژ دەوترێ، ئەگەر کورتیش بکرێتەوە وشەی نوێ پەیدانابێ .. جا وەك گشت لایەکمان دەزانین هەموو (ی — î )یەکی ناوەڕاستی وشەی

کوردی درێژەو هیچ کاتێك کورت نییە ، تەنیا مەگەر وشەیەك دوو (ی ـ تێدا بێ‌و هێز ( النبرە ـ stress ) بکەوێتە سەر یەکێکیان ، ئەودەم ئەوی‌دیان کەمێك کورتتر تەلەفوز دەکرێت ، ئەمەش دیاردەیەکی فۆنەتیکی‌یەو ئاشکرایە هەر بزوێنێ هێزی لەسەر بێ پتر دەردەکەوێ ... (ی ـ î )ی کۆتایی وشەش کە ( هەندێ جار کورت دەردەبڕێ هۆی ئەوەکە) هێزی لەسەر نییە یاخود بووەتە (ی ـ y) کۆنسۆنانت . جا بەوپێیە نووسینی بزوێنی (ی ـ î)ج بە دوو (ی)و ج بە ( ی ـ کەشیدەیەکی لەسەر) هەڵەیە .

هەر لە کورت‌و درێژی بەدەمدا هاتنی بزوێنی (وو ـ û )دا چەندین نموونەی ئاشکرا هەیە . بەوێنە ئەو بزوێنە لە «نووسین ، پێنووس .. » دا درێژتر تەلەفوز دەکرێ وەك لە « نووسرا ... » ، هۆی ئەمەش ئەوەیە کە لە وشەکانی « نووسین ، پێنووس ...»دا هێز لەسەر دەنگی (وو ـ û )ە ، بەڵام لەوشەی « نووسرا ....»دا هێز دەخرێتە سەر دەنگی (ا) ... لە وشەی «برین»دا (ی) درێژتر دەوترێ وەك لە وشەی «بریندار»دا ، چونکە لە وشەی یەکەمدا هێز لەسەر بزوێنی (ی)ەو لە وشەی دووەمدا لەسەر بزوێنی (ا)یە ... لە زمانی کوردیدا دیاردەی گوێزانەوەی هێز لە بڕگەیەکەوە بۆ بڕگەیەك زۆر باوە ، بەڵام بەداخەوە لە مەسەلەی ڕێنووسدا ڕەچاو نەکراوە ... (١٠) هەر بەوچەشنە باش دەرکەوتنی بزوێنی ( أ ) لە هەندێ باردا ، هۆی ئەوەیە کە هێزی لەسەرە ، بەڵام ئەو بزوێنە کە خۆی لە ڕەسەندا زۆر کورتە کاتێ کە هێزیشی لەسەر نەبێ ئەوە بزر دەبێ ... لەو نموونانەی دەربارەی بزوێنی (وو ـ û )و (ی ـ î) هێنامانەوە ، بینیمان لەباری بێ‌هێزیدا وەك (سەر)و (ژێر) دەوترێن ــ واتە نیو ئەوەندەی ئەسڵی خۆیان لێ دێ . جابۆیە سەیر نییە ئەگەر بزوێنێکی ئێجگار کورتی وەك ( ا ) لەباری بێ‌هێزیدا بە دەرنەکەوێ شتێکی ئاساییە .

بەمەدا دەرکەوت ئەگەر دەنگێ هێزی لەسەر نەبێ ، ئەوە کورتتر دەوترێ وەك ئەوەی هێزی لەسەر بێ . جا بۆ پاراستنی قالبی وشە ڕاست وایە لە هەردوو حاڵەتەکەدا ــ واتە بوونی هێزو نەبوونی‌دا ــ وەك یەك بنوسرێن . ئەمەش کارێکی ڕاستەو لەگەڵ زانستی زماندا دەگونجێ .

سەرەڕای مەسەلەی هێز ، هەروەها بۆ زێدە ڕوون‌کردنەوە لە هەندێ کێشەی دی دەدوێم ، کە ئەوانیش هەر بەهۆی نەبوونی ئێکۆڵینەوەی فۆنەتیکەوە لە ڕێنووسدا گیروگرفتیان پەیداکردووە ، بەوێنە وەك نەنووسینی هەندێ پیت‌و پەیڕەوی نەکردنی پاراستنی بناغەی وشەو کاری فۆنەتیك لە ڕێنووسی کوردیدا :

وشەکانی وەك : وچان / ووچان ، وژە / ووژە ، وڵات / ووڵات ، ورگ / وورگ ، ورتە / وورتە ، ورووژان / وورووژان ، ورووکاز / وورووکان ، وریا / ووریا ، وڕ / ووڕ ، وڕە / ووڕە ، وڕێنە / ووڕێنە ، وس / ووس ، وسڵ / ووسڵ ، وسمە / ووسمە ، وشە / ووشە ، وشك / ووشك ، وشتر / ووشتر ، وتن / ووتن ، وتار / ووتار ، وزە / ووزە ... کە بە دەنگی (و)ی کۆنسۆنانت دەست‌پێ‌دەکەن ، هەندێ لەو ڕایەدان کە بە یەك واو بنووسرێن‌و هەندێکیش نووسینی دوو واو پەسەند دەکەن .

بەشێك لەوانەی یەك واو دەنووسن ، بێ‌ئەوەی بیریان لێ کردبێتەوە ، هەر لەخۆڕا وایان بەلاوە باشترە .. هەرچەندە بەشەکەی دی لەئەنجامی لێکدانەوەو بۆچوونەوە ئەو هەڵوێستەیان وەرگرتووە ، بەڵام تا ڕادەیەك کەوتوونەتە هەڵەوە . مامۆستا مەسعوود محەمەد کە لایەنگیری یەك واو نووسینە بەڵگەی ئەوەیە کە دەڵێ : « لە نووسینی ئەو وشانەی بە (ر)ی قەڵەو دەست‌پێ‌دەکەن ، نووسەران دەڵێن پێویست نییە نیشانەی (ر)ی قەڵەو بخرێتە سەر ، چونکە هەمیشە دەنگی (ر) لە سەرەتای وشەدا بە قەڵەوی دەردەبڕدرێت ، کەواتە لزووم بە نیشانە ناکات (١١) . کە ئەم لێکدانەوەیەو ئەو بڕیارە قبووڵ بکرێت ، دەبێ بەنیسبەت وشەی (ورچ ، وشە ، وزە .. ) یشەوە هەمان لێکدانەوە بکرێت » (١٢) . لە سەرێکەوە جیاوازی لەنێوان (ڕ)ی سەرەتای وشەو ( و ـ w )ی کۆنسۆنانتدا ، کە کورتە بزوێنی ( و ـ u ) یان ( ا )ی بەدوادا دێت ، هەیە . لە سەرێکی‌تریشەوە فڕێدانی وێنەی دەنگێك دەبێتە هۆی پەیدابوونی ناتەواوی لە پارچە پێکهێنەرەکانی وشەدا . جا کە تێکڕای دەنگەکانی وشەیەك وێنەیان ئاشکرا نەبوو ، ئەوە ئەو ڕەچاو نەکردنە نەك هەر لادانە لە ڕێڕەوی زمانەوانی ، بەڵکو لە زۆر ڕووشەوە دەبێتە گیروگرفت . بەوێنە ئەگەر

تەماشای وشەی «وزە» بکەیـن دەبینین لـە چـوار دەنگ ( و ـ w / و ـ u / ز ـ z / ە ـ e ) و دوو برگە ( وو ـ wu / زە ـ ze ) پێکهاتووەو لە هـــەر برگەیەکیاندا بزوێن هەیـەو وەك ئاشکراشە مەرجە لە برگەدا بزوێن هەبێ . جا کە ئەم وشەیە بـە دوو واو نووسرا ، ئەوە هیچ دەنگێکیان بێ نیکـــار نابێو هیـــچ برگەیەکیان ناتەواوی تێناکەوێ . کـە دەنگەکانیش لە نووسیندا وێنەیان وا ڕوون بێ ، ئەوە گیروگرفت نایەتەڕێ . بەڵام بێتوو ئەو وشەیە بە یەك واو بنووسین ، ئەوە دەنگێکیان بێوێنە دەمێنێتەوەو برگەیەکیان کەم دێنێ . سەرەڕای هەمـوو ئەوەش ، ئەمە سەر لە قوتابیان و ئەوانەی فێری زمانی کوردی دەبن تێكدەدات . بێگومان لە دانانی ڕێنووسدا زۆر گرنگە مەسەلەی پەروەردەش ڕەچاو بکرێ .

هەندێك لەوانەی دوو واو دەنووسن ، بەهەڵە وا تێگەیشتوون کە ئەو جۆرە وشانە بە بزوێنـــی ( وو ـ û ) دەستپێدەکەن . هەرچەندە کۆمەڵـی دووەم لە ڕێگەی ئێکدانەوە بۆ ئەوە چوون کە بـەدوا دەنگی ( و ـ w )ی کۆنسۆنانتی سەرەتادا کورتـە بزوێنی ( و ـ u ) دێت ، بـــەڵام لێکۆڵینەوەی تەواویان نەکردووە ، لەمڕووەوە بۆچوونی مامۆستا نووری عەلی ئەمین ، بەتایبەتی کە پێکهاتنی برگەکانی ئەو جۆرە وشانەو بوونی ئـــەو کورتە بزوێنـــی ( و ـ u ) ی کردۆتە بەڵگەی دوو واو نووسین (١٢) ، ڕایەکی زانستییەو شایانی باسە . بەڵام لەگـــەڵ ئەوەشدا بۆ تەواو ڕوونکردنەوەو چەسپاندنی ئـــەو ڕایە هەندێ لایەن و بەڵگەی دی هـــەن ، کـــە لێیان دەدوێین .

بەر لە هەموو شتێك گومان لـەوەدا نییە کـــە ئەو وشانە بە بزوێنی ( وو ـ û ) دەستپێناکەن ، چونکە وەك ئاشکرایە ئەگەر بزوێن بوایە ، دەبـــوو ( ئـ ) لە پێشیانەوە پەیدابێ و بووترێ « ئووشـــە ، ئووریا ، ئووشـــك ، ئوورتە .. » . دەشزانین کە وا ناوترێ .

گومان نییە کە دەنگی سەرەتای ئەو وشانـــە ( w )ە ، بەڵام دەبێ بکۆڵینەوەو بزانین دووەم دەنگ ( ü )م یان ( i )ە . جا کە گەیشتینە ئەو ئەنجامە ، ئەوسادەتوانین بڕیار بدەین کە چۆن بنووسرێ ..

لە فەرهەنگەکەی مامۆستا تۆفیق وەهبی و س . ئەدمۆنس‌دا تێکڕای ئەو وشانـــەی بە ( و ـ w ) کۆنسۆنانت دەست پێدەکەن ، پیتی ( u ) یان بەدوادا هاتووە ، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ئەو دوو زانایە باوەڕیان وایە دەنگی دووەمی ئەو وشانە کورتە بزوێنی ( ü )ە (١٤) . لە فەرهەنگی مامۆستا قەناتی کوردۆدا زوربەی وشەکان هەر بەوچەشنە تۆمارکراون ، بەڵام چەند وشەیەك بە هەردوو شێوە ـ واتە پیتی دووەم ( ü ) و ( i ) ـ نووسراون . ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە مامۆستا کوردۆ وای بۆچووە کە لە هەندێ وشـــەدا دەنگی دووەم دوور نییە ( i ) بێت (١٥) .

من لەوڕایەدام کە دەنگی دووەمی زوربەی هەرە زۆری ئەو جۆرە وشانە کورتە بزوێنی ( u )ە ، بـــەڵام وشەی ئەوتۆیان لە ناودا هەن ، کە بەدوا ( و ـ w )ی کۆنسۆنانتدا بزوێنی ( i ) هاتووە . بێگومان ئامێری تایبەتی پێوانەو کێشانەی دەنگ و قووڵبوونەوە لـــە باسای فۆنەتیکی زمانەکەماندا باشترین ڕێگـــەی ساغکردنەوەی ئەو ڕێگەیەیە . بەداخەوە ئێمە هێشتا نەبووینەتە خاوەنی ئەو جۆرە ئامێرانەو لێکۆڵینەوەی فۆنەلیکی زمانەکەشمان هێندە کـــزە تازە بەئاستەم توێژی سەرەوەی خەریکە دەردەکەوێت . جا منیش لێرەدا هەر ئەوەندەم لە دەست دێ کە لەو توێژاڵەی سەرەوە بەڵگە بێنمەوە .

بۆنموونە لە زمانی کوردیدا (گوتن ـ gutin) یش و (ووتن ـ wutin )یش دەوتـرێ . گۆڕانـی دەنگی ( و ـ w ) ش بە (گ) هەیـــە . دیارە کـە (گوتن)و (وتن) هەر یەك وشەن و تەنیا یەکـەم دەنگ گۆڕانی بەسەردا دێت . لە (گوتن)دا ئاشکرا دیارە کـە دووەم دەنگ کورتە بزوێنی ( و ـ u )ە . جا بەوپێیە لە (وتن)یشدا هەر هەمانبزوێن بـەدوا (و ـ w )دا هاتووە ... لە وشەی ( حوشتر / ووشتر)یشـــدا هەمان دیاردە دەبینین ـ واتـــە دەنگی (ح)و بەیەك دەگۆڕدرێنەوە . بزوێنی ( و ـ u )ش ڕەوان لەدوای (ح)ەوە هاتووە . جا دەبێ هەر ( u )ش بـێ بەدوا ( w )شدا هاتبێ .

پەمەداو بە گوێڕاگرتن لە تەلەفوزکردنی زوربەی ئەو جۆرە وشانە وا دەردەکەوێ کە دەبێ بەدوا (و ـ w)ی کۆنسـۆنانتدا کورتە بزوێنی ( و ـ w ) بێت / بەڵام پێویستە سەرنج بۆئەوە ڕابکێشین کـــە بزوێنەکانی دیش بەئاشکرا لەدوای ( و ـ w )ەوە دێن ، وەك : «وازهێنان ، واشە ، واتـە ، وانـــە ... وەتەن ، وەڕین ، وەجاخ .. وێڵ ، وێر ، وێژە ، وێـــرا .. هتد» . جا کەوابوو پێویستە بیـر لەوەش بکەینەوە ، کە ئایا کورتە بزوێنی ( i ) بـــەدوا ( و ـ w )دا دێت یان نـــە ؟

ئەگەر لە هەردوو دیالێکتـــی سەرەکیی کوردیدا

بەراوردێك لەنێوان هەندێ لەو جۆرە وشانەدا بکەین ، بۆمان ئاشکرا دەبێ ، کە حاڵەتی ئەوتۆ هەیە بەدوا ( و ـ w )ی کۆنسۆنانتی سەرەتای وشەدا کورتە بزوێنی ( i ) دێت . بە وێنە لە کرمانجی ژووروودا دەوترێ «هرچ ـ hirç ) هشك ـ hişk ... » ، لە کرمانجی خواروشدا « ورچ ـ wirç ، وشك ـ wişk ... » . دیاردەی گۆڕانی دەنگی ( هـ ـ h ) بە ( و ـ w ) بارەو کێشەی لەسەر نییە . هەرچی دووەم دەنگە لە دیالێکتی ژووروودا ئاشکرایە کە کورتە بزوێنی( i ) ەو بە هیچ جۆرێك ( u ) نییەو هیچ کات « هورچ ـ hurç ، هوشك ـ huşk / ناڵێن : بەوپێیە دەبێ لە دیالێکتی خواروشدا دەنگی دووەم ( i ) بێ‌و وشەکان « ورچ ـ wirç ، وشك ـ wişk ... » بن .

بەوپێیە دەبێ لەپێشەوە هەندێ کێشەی فۆنەتیکی زمانەکەمان ساغبکەینەوە ، ئەوسا بڕیاری نووسینی یەك واو یان دوو واو بدەین : ئەگەر ئاشکرا بوو کە بە دوا دەنگی ( و ـ w )دا کورتە بزوێنی ( و ـ u ) هاتووە ، ئەوە لەبەر ئەو هۆیانەی پێشتر نیشانماندان ، باشترە بە دوو واو بنووسرێ . (١٦) خۆ بێتو کورتە بزوێنی(ii) ی بەدوادا بێت ، ئەو دەم ڕاستتر وایە بە یەك واو بنووسرێ (٧١) .

دەزانین لە وشەکانی « دوو ، موو ، مووروو ، بەڕوو ، ئارەزوو ، جوانوو ، تەرازوو ... »دا دەنگی کۆتایی بزوێنی ( وو ـ û )ی درێژەو ئەمە لە ڕێنووسی باوی کوردیدا دوو پیتی واوی بۆ کراوەتە نیگارو کۆڕیش پیتێکی واو و کەشیدەیەکی لەسەر بۆ پەسەند کردووە ... هەروەها ئەوش دزانین کە دوو دەنگی بزوێن پێکەوە نایەن‌و لە حاڵەتی پاراستنیاندا کۆنسۆنانتی (ی ـ y )یان ( و ـ w ) دێتە نێوانیانەوە . بۆندوونە کاتی نیشانەی (ان)ی کۆ بخرێتە سەر وشەیەك کە کۆتایی بە بزوێنی ( a ، ێ ... ) هاتبێ ، ئەوە کۆنسۆنانتی (ی ـ y ) پەیدادەبێ ، وەك :

برا + ی ـ y + ان = برایان

پێ + ی ـ y + ان = پێیان

بەڵام ئەگەر وشەیەك کۆتایی بە بزوێنی ( وو ـ û ) بێت‌و نیشانەیەکی بە بزوێن دەستپێکردووی پێوە بلکێنرێ ، ئەودەمە لەنێوان وشەو نیشانەکەدا کۆنسۆنانتی ( و ـ w ) دێتە کایەوە . بەوێنە :

ا) نیشانەی (ان)ی کۆ :

mûrû + w + an ⟶ mûruwan

berû + w + an ⟶ berûwan

ب) نیشانەی (ەکە)ی ناسیاوی

arezû + w + eke ⟶ arezûweke

terazû + w + eke ⟶ terazûweke

ح) نیشانەی (ە)ی ناسیاوی

tû + w + e ⟶ tûwe

cû + w + e ⟶ cûwe

....و هەندێکی‌تر :

ڕاستە لەم حاڵەتانەدا بزوێنی (وو)ی کۆتایی وشەکە کەمێك لە باری ئاسایی کورتتر دەوترێت ، بەڵام ئەم دیاردەیە کە هۆی جێگۆڕینی هێز یان پێکەوەهاتنی دەنگی وێکچوو یاز. دەنگەکانی دەوروبەر.....ە ، نابێ ببێتە هۆی شێواندنی بناغەی وشە .

هەندێ‌کەس بێ‌ئەوەی بیر لە ئاکام بکەنەوە وایان باش زانیوە چۆن بەدەمدا دێت هەر بەوچەشنە بینووسن . لە سەرێکی تریشەوە نادروستی نیگاری بزوێنی ( وو ـ û ) نووسەرانی ناچارکردووە فەزڵی هەڵە بەسەر ڕاستدا بدەن . بۆنموونە دەنووسن ( جوانووەکە ، دوودم ، جووە ... ) ، کەچی ڕاستەکەی ( جوانوووەکە ، دوووەم ، جوووە .. ) یە . شێوەی نالەباری سێ واو بەدوایەکدا هاتن وای لە خەڵك کردووە واوێکیان فڕێبدەن . بەڵێ لە ڕووی ڕووخسارەوە دوو واو جوانترەو سێ واو بەیەکەوەنووسین ناشیرینە ، بەڵام لە ڕووی ناوەڕۆك‌و واقیعی زمانەوانییەوە دوو واو هەڵەیەو سێ واوە ناشیرینەکە ڕاستە .

بەپێی ڕێنووسی کۆڕیش کە لەبریتی دوو واو ( وـ کەشیدەیەکی لەسەر ) پەسەندکراوە ، دەبوو بنووسن ( جوانووەکە ، دووەم ، جووە ... ) ، کەچی‌دەنووسن ( جوانووەکە ، دووەم ، جووە .. ) . لێرەدا کورتبوونەوە کۆڕی بەوهەڵەیەدا بردووە کە وێنەی فۆنێمی ( و ـ u ) لەجێی وێنەی فۆنێمی ( وَ ـ û ) دابنێت . وەك ئاشکرایە ، لە ڕووی زانستی زمانەوە هەڵەیە وێنەی فۆنێمێك بۆ فۆنێمێکی‌تر دابنرێ . سەرەڕای ئەوە ئەمە بناغەی وشە تێك دەدا چونکە ئەگەر لە رووی وێنەی ئەو نووسینەوە وشەو نیشانەکان لە یەك جیابکەینەوە ، ئەوە (جوانو ، دو ، جو ) دەمێنێتەوە . جا لەمسەرەشەوە هەڵەیەکی‌تریش سەر هەڵدەدات .

ئەودی لەم‌بارەیەوە پتر جێی ڕەخنــــە بــێ ، ئەوەیە لە چاپەمەنییەکانی کوردا ، بەتایبەتی لەوانەی مامۆستا مەسعوود محەمەددا وشەی ( dûwem ) نووسراوە ( دوەم ) . باشە ئـەم وشـەیە کـە لــە ( dû + w + em دوٚ + و ـ ω + ەم ) پێکهاتووە ، کوا پیتی ( وٚ ـ ûـ ) ەکەی ؟ . خۆ ئەگەر لەسەر بناغەی ئـەم جۆرە نووسینە تەماشای ڕۆنانی ئــەو وشــەیە بکەیـن ، ئـەوە دەبینیــن لــە ( د + و ـ ω + ەم ) سازبووە ، واتە لە نیگارەکانی وشەی (دوٚ)دا تەنیا پیتی دال دیارە . بەلای منەوە لە هەموو ڕوویەکەوە نووسینی (دوەم) هەڵەیــە ، جــا با لە هەندێ ناوچە بزوێنـــی (وٚ)ش قووت‌بدرێ . بەو پێیە بێ دەبێ لە نووسیندا دالــە کلۆرەکــەی نەنووسرێ .

پەیڕەوی کردنی پاراستنی بناغەی وشەو کاری فۆنەتیك هەندێ حالەتی‌دیی وشــە دێنێتەوە بیــر :

ئەگەر دوو دەنگی وێکچوو یاخود لێك‌نزیــك بکەونە پاڵ یـــەك ، ئەوە لـــە دەربڕیندا یەکێکیان ون‌دەبێ . بەوێنە کاتێ نیشانەی (تر)ی بـــەراورد ئیزافەی سەر وشەی «کورت» دەکەین ، ئــــەوە دەبێتە «کورتتر» ، بـــەلام لـــە دەربڕیندا دەوترێ «کــورتــر» . «پــاك‌کردن» کـــە لـــە (پـــاك)و (کردن) پێکهاتووە ، بە « پاکردن » بەدەمدا دێت . . وشەی « دەست‌کەوت » کە لە (دەست + کـەوت ) سازبووە بە « دەسکەوت » تەلەفوز دەکرێ ، چونکە لەسەرێکەوە دەربڕینی سێ دەنگی ( س ، ت ، ك )ی کۆنسۆنانتی کـــپ پێکەوە خۆش‌و ئاسان نییە ، لــە سەرێکی‌تریشەوە لە زمانی کوردیدا (ت) کە لەدوای (س)ەوە دێت ، زۆر جار قووت‌دەدرێ . بەوێنە لــە زۆر جێگـــە (دەســـــت) دەبێتـــــە (دەس) ، (مەبەست) دەکەنە (مەبەس) . . .

بە ڕای من ڕاست نییە ئەو جۆرە وشانە لەسەر بناغەی تەلەفوز بنووسرێن ، بەڵکـو لـــە نووسیندا پێویستە شێـوەی پێکهاتنیـــان ڕەچاوبکرێ‌و ئــەو پەڕاندن‌و ون‌بـوون‌و تێکەڵاوبوونە ڕەنگ‌نەداتەوە ـ واتە ڕاسترە بنووسرێ : کـورتتر ، پاك‌کـــردن ، دەست‌کەوت . . .

بەڕاستی تێ‌چوونی دەنگـی (ت)ا ڕوون‌کردنەوەو لێکۆڵینەوەی تەواوی دەوێ ، چونکە لە زۆر جێگەدا بێ ڕەچاوکردنی نێزیکی‌و دووریی نێوان دەنگەکان ئـەم (ت)ە دەقــرتێ ، وەك دەوترێ (دەڕوا) لــە جیاتـــی ( دەڕوات) . یاخود لە شێوە ئاخاوتنی سلێــمانی زۆر جێگەدا (ت)ەکە کلۆر دەکرێت ، وەك کە دەڵێـــــن « ئەمە . . . (و) لەچی » لەبریتی «ئەمـــەت لەچی» ، یاخود « ڕا . . (و) لێیە » لەجیاتی «ڕات لێیە» . . .

بێ‌گومان ئەو جۆرە قرتاندن‌و کلۆرکردنە کــــە تایبەتی‌یە بە ناوچەیەك ، نابێ لە زمانی ئەدەبـــــی‌و نووسیندا ڕەنگ‌بداتەوە .

هەروەها ئەگەر (ی)ی ئیزافە بخرێتــە ســـەر وشەیەکی کۆتایی هاتوو بە بزوێنی (ی) ، ئەو کاتـــە نیشانەی (ی)ی ئیزافــە لەتەلەفوزدا دەرناکـــەوێ ، وەك : « ڕێوی قەمچووغە ، ماسی گـــەورە . . » . بۆ نیشاندانی باری ڕێزمانی‌و بوونی دۆخی ئیزافــە . باشتروایە (ی)ی ئیــزافەکە بنووسرێ‌و بـــەلام بــا نەخوێندرێتەوە ـ واتـــە پێویستـــە بنووسـرێ : «ڕێویی قەمچووغە ، ماسیی گەورە . . .» . بەداخەوە کۆڕی زانیاری کورد تەنیا بەدەمدا هاتنی ئەو وشانەی ڕەچاوکردووەوە بڕیاریداوە ، ئەگەر (ی)ی ئیزافـــە چووە سەر ئەو وشانەی کۆتاییان بە دەنگی (ی) دێــت نەنووسرێت . (١٨)

وەك ئاشکرایە لە پێکهاتنی کرداری داخـوازی‌و ئیلزامیدا نیشانەی (ب) هاریکارە . هەندێ‌جار ئـەو (ب)ە قووت‌دەدرێ‌و زوربەی نووسـەرانیش لەســـەر بناغەی ئەو بەدەمداهاتنە دەنووسن : (ڕاکە ، هەڵگرە ، وەرگرە . . . ) . بەڵێ خەڵك ئازادە کە بەپێی ڕاهاتنی زمان‌و شێوەی ناوچەی خۆی نووسراو بخوێنێتەوە ، بەلام ئەمە نابێ کار لەشێوەی نووسینەکە بکات . جــا ڕاست‌ئەوەیە لە نووسیندا بنچینەو قاڵبی وشـــــە بپارێزرێ . بەوپێیە پێویســـتە بنووسرێ (ڕابکـــە ، هەڵبگرە ، وەربگرە . . . ) .

لە شێوەی ئاخاوتنی سلێمانیدا زۆرجار ئـەوە بەرگوێ دەکەوێ کە دەنگی (د) کلۆر دەکرێـت ، وەك (مناڵ) لەبریتی (منداڵ) ، (مەحمـــوو) لەجیاتـــــی (مەحموود) ، ( کرانـــی) لەبریتـــی (کرانـــدی ) . . . سـەرەڕای ئـــەوە هەنــــدێ لە نووسەران پێشنیاریان کردووە کە نیگاری بۆ بکێشرێت . با شێوەی سلێمانی بناغەی زمانی ئەدەبیشمان بێت ، بەلام نە ئـــــەو شێواندنەو نە ئەو تایبەتی‌یە ناوچەییە ڕاست نییە لــە نووسین‌و زمانی نووسیندا شوێن پێیان دیار بـــێ . مامۆستا تۆفیق وەهبیش کە لەم بارەیەوە نووسیوێتی: «(د)ی کلۆر دەبێ بەجارێ بکرێتە دەرەوە لە زمانـــە ئەدەبیەکەمان ، وەئەو جێیانەشدا کە (د)ە کلۆرەکان کەوتوون ، یان گۆڕاون بە دەنگێکی‌تر ، (د)ی پتـــەو

بخرێتەوەکار » (١٩) ، تەواو ئـــەو ڕایەمـــان دەچەسپێنێ .

دەزانم ئەو چەند باسەی ســـەرەوە تاڕادەیەك دوور کەوتنەوەیە لە مەبەستی سەرەکی ئـەم وتارە ، بەڵام لەو ڕێگەیەوە ویستوومە ئەوە ڕوونبکەمەوە ، کە لە لێکۆڵینەوەی فۆنەتیك‌و ڕێنووســی کوردیـــدا ڕەچاوکردنـــی دیاردەی کورتکردنەوەو تێچـوون‌و گۆڕانی دەنگ زۆر گرنگە . هەروەها کێشەی کورتـە بزوێنی ( ِ ) ش لە زۆر ڕووەوە نێزیکیی لەگەڵ ئـــەو باسەدا هەیە .

ئەگەرچی ڕای ئێمەو مامۆستا مەسعوود محەمەد لە هەندێ کێشەی فۆنەتیك‌و ڕێنووسدا یەك ناکەون ، بەڵام ئەمە ئەو ڕاستییەم لێ ناشێوێنێ کـە ئـــەو وتارانەی دەربارەی فۆنەتیك‌و ڕێنووسی کـــوردی نووسیونی بە بەرهەمی باش‌و سەرکەوتوو و زانستـی ئەو مەیدانە دابنێم‌و لەو ڕایەدا بم کە لە لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا گەلێ دەستکەوتی گەورەو نویـــێ هێناوەتە ئەنجـام .

## پەراوێزەکـان :

(١٠) بە ڕای ئێمە ، نووسینمان وەك نووسینی هەندێ لە زمانە ئەوروپاییەکـــان ، بەتایبەتی بـــۆ هەڵەنەکردن لە نووسین‌و خوێندنەوەی هەنـــدێ وشەداو بۆ تۆمارکردنیان لە فەرهەنگدا پێویستی بـە بوونی نیشانەی (هێز ـ stress )ە . هەرچەنـدە بوونی ئەو نیگارە گیروگرفت دەڕەوێنێتەوە ، بـــەڵام پێویست ناکا بۆ هەموو وشەیەك بەکاربهێنرێ ، بەڵکو تەنیا لە کاتی پێویستدا بۆ جیاکردنەوە .

(١١) وەنەبێ تێکڕای نووسەران بڵێن پێویـست نییە نیشانەی (ر)ی قەڵەو بخرێتە سەر ، چونکـــە هەمیشە دەنگی (ر) لـــە سەرەتای وشەدا بە قەڵەوی دەردەبڕدرێت ... من بەش‌بەحاڵی خۆم لایەنگیـری ئەو ڕایە نیم‌و وایدەگەم ئەو کەسانە زۆر بەهەڵـەدا چوون ، چونکە لە زمانی کوردیدا دوو فۆنێمی (ر)و (ڕ) هەیە ـ واتە یەکێك لاوازو یەکێك قەڵەو . بەوێنە لە وشەی «کەر»دا ئەگەر فۆنێمی (ر) بکرێت بـە (ڕ) ، ئەوە وشەی (کەڕ) پەیدادەبێ کە جیاوازییەکی تەواو لە مانایاندا هەیە . جـــا بەپێی ئـەو پێویستی‌یە لـــە ڕێنووسی کوردیدا دوو پیت بۆ ئـەو دوو فۆنێمـــە دانراون ، کە ئەوەش نیشانەی جیاکردنەوەیانە . جـا هەر لەبەرئەوەی هەموو (ر)یەك کە لە سەرەتای وشەی کوردییەوە دێت قەڵەوەو کورد هیچ کاتێـك دەم بـە (ر)ی لاوزا ناکاتەوە ، ڕاست نییە بچین وێنـــەی فۆنێمێکی‌تر لەجێـی دابنێین ، بەتایبەتی کـە ئـــەو فۆنێمە وێنەی خۆی هەبێ . دانانی وێنەی فۆنێمێك بۆ فۆنێمێکی‌تر ، نەك هـــەر پەیڕەوی نەکردنـــی دەستووره سەرەتایی‌یەکانی زمانەوانی‌یە ، بەڵکـــو پەیداکردنی گیروگرفتێکی نوێ‌یشـە .

(١٢) مەسعوود محەمەد ، سەرچاوەی ناوبراو ، ڕینووسی کۆڕ ، ل ٢٧٤ .

(١٣) نووری عەلی ئەمین ، ڕابەرێ بۆ ئیمـلای کوردی ، بەغدا ، ١٩٦٦ ، ل ٣٢ ـ ٣٣ .

(١٤)

Taufiq wahby and C. J. Edmonds , A Kurdish — English dictionary , London , 1966 , P. 154 — 155 .

(١٥) قەناتی کوردۆ ، فەرهـــەنگی کوردی ـ ڕووسی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ل ، ٧٩٢ ـ ٧٩٣ .

(١٦) ئـــەو دوو واو نووسینەش هەمـــــوو گیروگرفتەکان لاناباو بەشێکی هەر دەمێنێ ، چونکـە دوو واو کە یەکەمیان وێنەی کۆنسۆنانتـی ە و دووەمیان وێنەی کورتە بزوێنی ە خاوەنی یـەك نیگارن . جا دەمێك کێشە نامێنێ کـە لـە ئەلفوبێـی عەرەبیدا نیگار بۆ ش بکێشرێ .

(١٧) ئەمیش ئـــەو ناتەواوییەی هەر تێـــدا دەمێنێ ئەگەر ئەو ڕێنووسە وێنەی دەنگـی ی بۆ زیاد نەکرێ .

(١٨) بڕوانە : کۆڕی زانیاری کورد ، ڕێنووسی کوردی ، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد» ، ب ١، ٢ ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٣٦٤ ـ ٣٧٩ .

(١٩) تۆفیق وەهبی ، ئەسڵی پیتە قاڵبی (ئە)ی شێوەی سلێمانی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ١ ، ٢ ژ ١ بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٣١ .

# شوێنگا سروشتییە کۆنەکان لە عیراقدا

نووسینی : فۆادسفر
گۆڕینی : کمال نوری معروف

دوای‌ئەوەی دوا سەدەی سەهۆڵین کۆتایی‌هات ، سەردەمێکی گەرمی پێش (١٠) دە هەزار ساڵ دەستی‌پێ‌کرد ، ئەو سەردەمە ئاووهەوا هەر وەکو ئەو ئاووهەوایە بو کە ئیستا پێی ئەژین . مانای ئەوەیە ئەو ئاووهەوا یەی لە وولاتمان‌دا هەیە لە چاخەکانی بابلی ئاشوری‌و پێش ئەوانیش لە چاخی سۆمەری‌دا لەگەڵ ئاوو هەوای ئێستامان‌دا جیاوازیەکی ئەوتۆی لەڕووی پلەی گەرمای هاوین‌و زستان‌و ئەو بارانەی ئەباری‌و هەروەها لەڕووی هەڵکردنی هەواوە نەبووە . زاناو شارەزایان رایان وایە کە ئاووهەوا لەو وولاتانەی ئەکەونە خوارووی رۆژئاوای ئاسیا لە کۆن‌دا بەم جۆرە بوە . لەوانە (فان زایست) کە ڕای خۆی لەگەڵ (رایت) لە ساڵی ١٩٦٣ لەژێر سەر ناوی «دراسات اولیە لغبار الطلع فی بحیرە زریبار بجبال زاگروس» بڵاو کردەوە . دوەم جار (رایت) ئەم رایەی بەتەنیا لە نووسینێکیا بە ناونیشانی «البیئە الطبیعیە فی بدایە انتاج القوت فی شمالی ما بین النهرین » بڵاو کردەوە . لەم دواییەدا (دیانا کرکبرج) لە (ام دباغیە) کە ئەکەوێتە نزیك شاری حەزەر بەهۆی کنەکردنەوە گەیشتە هەمان باوەرەو دەڵێت : «ئەو باسانەی کە پەیوەندی بە روەك‌و حەیوان‌و توێکڵی زەوی یەوە هەیەو ئەوەی خۆم بەهۆی کنەکردنمەوە گەیشتومێتی لە گردی (ام دباغیە) لە ماودی هەشت هەزار ساڵی رابووردو نیشانی‌ئەدا هیچ گۆڕانێك لە ئاووهەوای ناوچەی ئەم گردە لەو کاتەوە کە مرۆڤ تیا جێگیر بوە نەبوە.

لە ڕاستیدا ئاووهەوا پێش (ام‌الدباغیە) بە (٢٠٠) هەزار ساڵ لەو کاتەوە کە مرۆڤ لە یەکەم دێی کشتوکاڵیدا جێگیربوو وەکو خۆی مایەوە . چەند بەڵگەیەکمان بەدەستەوەیە کە ڕووەکو حەیوان لە عیراقی کۆندا گۆڕانێکی زۆری لە ماوەی (١٠) دە هەزار ساڵی رابووردو بەسەرا هاتووە ، زۆر جۆر حەیوانو دارستان کە رووی شاخەکانیان داپۆشیبو فەوتان . هۆ چییە بۆ ئەم هەموو گۆڕانە لە شوێنگا کۆنەکاندا ؟ ناتوانین بڵێین هۆی سووتان ، نەخۆشیو لافاوو خوێی زەوییە ، لەبەر ئەوەی ئاگر کە بەرئەبێتە دارستانێکو نابهێڵێت درای چەند ساڵێک دروستئەبێتەوە . نەخۆشیو بەڵا زۆر جۆر ئاژەڵو ڕووەک لەناوئەبات، بەڵام لەبەر فراوانی شوێنەکە ناتوانێت، هەمووی لەناوببات ، دوای نەمانی نەخۆشیە بەخێرایی زۆر ئەبنەوەو بڵاوئەبنەوە . لافاو ڕووەکی زەوی ناهێڵێ ئەگەر هاتو زۆر دەوامبکا دایئەپۆشێ ، ئەمەش نابێ بەهۆی لەناوبردنی رەگەزێك لە حەیوان یان جۆرێك لە ڕووەك . خوێی زەوی لە شوێنێکی دیاری کراودا ئیشی خۆی ئەکاو بڵاوبوونەوەی بەهۆی لافاوو ئاوی ئاودان ئەوەستێ . ئەمانە هۆیەك نین بۆ کۆڕین لە شوێنگا کۆنەکانی عیراقدا ، هۆی یەکەم بۆ ئەم گۆڕانە بۆسەر شوێنگا مرۆڤە . زۆر رەگەز لە ئاژەڵو دیمەنی سرووشتی بەهۆی دەسکاری مرۆڤ بۆ چاکردنی ژیانیو زاڵبوون بەسەر سرووشتدا نەمان . ئەمە بوو بە هۆی پێش خستنی شارستانیەتو خراپبوونی شوێدارەکان . مرۆڤ لە سەرەتای ژیانیا لەسەر راوو بەرو بۆمی دارو درەختو گەنمەکێوێلە ئەژیا ، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر هاتووچۆی ئەکرد چەند دێیەك پێش دە هەزار ساڵ دەرکەوتن ، مرۆڤ بە شێوەیەکی بەردەوام تیا دانیشت ، خۆراکی خۆی تیا هێنایە بەرهەم ، ئەمەش بە چاندنی دانەوێڵەو لەوەڕاندنی بزنو ئاسك . دوای ئەوەبە (٢) هەزار ساڵ زانی پێویستیەکانی ئاودان جێبەجێ بکات ، دوور نییە ئەو سەردەمەی کە خواردن زۆر بوو بەهۆی زانینی ڕێگای ئاودان دەستیکردبێ بە جێگیربوون لە خواروی عیراقدا . دانیشتوان زۆرتر بوو ، شوێنی تازەیان دروستکردو هەندێ دێ بوو بە شار . کۆمەڵ لە خێزانی بچووکی راوکەرەوە بۆ کۆمەڵێکی پێشکەوتووی چینایەتی کە هەموو جۆرە شاردزایەکی سەرەتایی تیا بوو پێشکەوت . لە(٣) هەزاردی پێش زایینی شاری شوورەداری وەرکا ، ئور ، لە گڵ دروستکراو بەشێوەیەکی جوان ڕێکخرا . شارستانیەتی سۆمەری رەسەن کە مرۆڤ سەرسام ئەکا گەیشتە ئەوپەری پێش کەوتن . عیراق لەو حەلەوە بوو بە لانەی شارستانیەتی پێشکەوتوو ، مەشخەڵەکەی ئەکەدیەکانو گۆتیەکانو خۆرییەکانو بابلیەکانو ئاشوریەکانو میدیەکان دوای ئەوانیش موسڵمانەکان دوور بۆ رۆژهەڵاتو رۆژئاوا گواستیانەوە . چەند شارستانیەت کۆنەو پێگەیشتوە لە وڵاتماندا بەو قەوارەیە سرووشت لە ڕێگای پێشکەوتنیدا تووشی زەرەر بوە .

(فلنیری) لە نووسینێکیا لە ساڵی ١٩٦٥ بە ناونیشانی (الایکولوجیا ابدایه طور انتاج القوت في بلاد الرافدین) گەیشتە ئەو رایەی کە بڵێ : «لە ڕاستیدا ئێمە باش ئەزانین کە دیمەنی سرووشتی تووشی زۆر نارەحەتیو گۆڕانو خراپکاری لە دەهەزار ساڵی رابووردودا هاتوە . بەخسیرکردنی سرووشت بە کێڵانی زەویو لەوەڕاندنی ئاژەڵو بڕینی دار رووی ناوچەکەی گۆڕی بۆ دەشتێکی بێ سوود کە هیچی تیا نەڕوێ بێجگە لە دڕك وەدەڵێت : « بەڵام توانا و سەرچاوەی کانی مەعدەنی زۆرە » . ئەوەی فلنبیری دەیڵێت لەگەڵ ئەوەشدا ڕاستە مانای ئەوە نیە کە وڵاتەکەمان پڕە لە زۆر جۆر حەیوانی کێوی دارستانی سرووشتی تیا نیە . دیارو ئاشکرایە شاخەکانی کوردستانی عیراق پڕە لە دارستانی سرووشتی بە قەوارەی لە ٤ ٪ی وڵاتی گرتۆتەوە ، بێجگە لەو دارستانە دروست کراوانە کە درووست بوە بەهۆی رواندنی داری خورماو ترشەلوكو گەلێکی تر . ئەمانەش زەویو زارێکی زۆر لە ڕۆخی ڕووبارو گۆلاوەکان لە خوارو دەگرن . دوای ئەوەی زانیمان ئاووهەوا وەکو خۆی ماوەتەوە شوێنگاکان بەرەو خراپ وون ئەڕۆن ، پێویستە پرسیاری بکەین ئایا شوێنگاکان لە هەر ناوچەیەك لە ناوچە جیاوازەکانو لە هەر سەدەیەك لە سەدەکانی پێشوو چۆن بوون ؟ .

ناتوانین ئێستا وەڵام بدەینەوە لەبەر ئەوەی زانیاریمان لەسەر شوێنگاکانی عیراق کەمە . ڕێگای وەڵامدانەوە بۆ ئەمە بە کۆکردنەوەی زانیاریە لەو سێ سەرچاوە ناسراوانە ئەمانەش سەرچاوەی بەرچاو ، نووسراو ، پاشماوەی کۆنە . سەرچاوەی بەرچاو مەرجە دارستانو ئاژەڵی هەموو ناوچەکە ببینرێتو لێی بکۆلرێتەوە بۆ زانینی شوێنگا کۆنەکە . سەرچاوەی نووسراو ئەو ئیشارەتانەیە کە لەسەر شوێنگای کۆن لە نووسینە کۆنەکانی بزماریو ئارامیو عەرەبییەکاندا هاتوە . بەڵام سەرچاوە ئاسارییەکان

ئەمەش بە کنەو پشکنین لە ورگی گردو لە زەوی ئەشکەوتەکاندا بۆ دۆزینەوەی پاشماوەی روەك و ئاژەڵ لە ئێسقان و گەنمە رەش هەلکەراوەکان و خەلوزو هەڵاتە ئەکرێت . لە ڕێگامان‌دا بۆ سلێمانی هەندێ گردو شاخی رووتەن دێنە ڕێگەمان ، بەڵام هەندێ جار دار بەڕوویەك ئەبینین ، بوونی نیشانەیە کە ئەتوانین ناوچەکە بکەین بەم جۆرە دارە ، ئەم دارە تاکانە رزگاریان بوە لە برینەوە بەو باوەڕەی کە پیرۆزن و ئەوەی بیبڕێت نەیامەتی بۆ دێنێ . ئەم دارانە بە زۆری لەسەر گۆڕەکانن . کە گەیشتینە سلێمانی لە پشت ئەم شارە جوانەوە ریزە شاخی ئەزمرو گۆێژە درێژبوونەتەوەو رووتەنن . ئەگەر شاخی ئەزمڕمان بڕی و چووین بۆ قەڵاچوالان چەند دارێکی ئەستووری گەورەی هەرمی دەبینین ، بوونیان نیشانەیە بۆ ئەوەی لە ناوچەکە ئەم جۆرە دارانە ئەڕوێت ، ئەگەر بەرەو ئامێدی بە ڕێگای مووسڵدا بڕوێن ، لە ڕێگادا تووشی ڕیزە شاخی ئەلقوش و بێخێر کە هەردووکیان رووتەنن ، بەڵام بوونی درەختێك لە لووتکەی ئەو شوێنە بەسە بۆ ئەوەی شوێنەکە بکرێت بە دارو درەخت . ئەودی لەو دەشتانەی ئەکەوێتە سەرووی شاخی سنجار رەچاوئەکرێت بوونی دارەبەن و بستەیە ، لە کێلگەی گەنم و جۆدا لەنێوان دێکان‌دا کە یەزیدی‌یەکان تیا دا نیشتوون بڵاو بوونەتەوە . ئەم درەختانە لەبەر ئەوەی پیرۆزە کەس ناچێ بەلایانەوە . ئەم دارە بڵاوانە دوور نیە درەختی سرووشتی بووبن پاشماوەی دارستانێکی گەورە . بەڵام پەنجە راکیشان بۆ باسی شوێنەواری لە نووسین و دانراوە کۆنەکانا زۆرە وا هەندێکیان لێرەدا ناوئەبەین ، دانیشتوانی عیراق بە سۆمەری و بابلی و ئاشوریەکان گەلێ جۆر فەرهەنگ‌یان بۆ روەك و حەیوان داناوە مامۆستای گەورە (لاند سبرجر) توانی کۆمەڵێك لەوانە کە پەیوەندی بە ئاژەڵەوە هەیە بڵاوبکاتەوە . دیارو ئاشکرایە کە حەیوانی (بیسون) لە کۆنا بە دەشتەکانی ئەمریکادا گەڕاوە ، دوور نیە لە کۆنا لە عیراقدا جۆرێکی بووبێ کە بە سۆمەری پێیان ووتوە (الم) ، لە سەردەمی سۆمەری کۆنا پیرۆز بوە . کاتێك فەوتا سۆمەری‌یەکان لە نەخش و نیگارەکانیان‌دا بەردەوام وێنەیان ئەکێشا ، سەرەکەی سەری گوێرەکەیەو ڕیشێکی درووست‌کراویان بۆ ئەکرد ، لەبەر ئەودی (بیسون) بە ڕیشەکەی لە گا جیائەکرایەوە . ئەمەش لە (قیثارە) ئالتوونیەکەی گۆڕستانی پاشایانی ئوور بەرچاوئەکەوێت ، ئەبینین



ریشەکەی بە شریتێك بە اووتی گوێرەکەکەوە بە پێشەودی (قیثارەکە) بەستراوەتەوە . ئەو ناوچەیەی ئەکەوێتە نێوان خابوورو فوراتەوە تۆتەمسی سێیەم فیرعەونی مصر راوی فیلی تیا ئەکرد . پاشای ئاشوری (تغلات بلاصر)ی یەکەم (١١١٢ ـ ١٠٧٤ پ. ز » دەڵی ! « دوای ئەودی هۆزەکانی ئەحلامی‌م لە هێرشی سەربازی پێنجەم‌دا بە بڕینی خابور راو نا ، لەو ناوچەیەی ئەکەوێتە نزیك شاری (حران) دە فیلم کوشت و چوارم بە زیندوویەتی گرت و رەوانەم کردەوە بۆ وولاتەکەم . لەم دوو ئیشارەتەدا دەرئەکەوی کە ژماردی فیلەکان لە زەمانی (تطمس سێ وە بۆ (تغلات بلاصری) یەکەم بەرەو کەم‌بوونەوە بوون . ژمارەیەك لەوانە لە ناوچەکەدا مانەوە هەتا زەمانی ئاشۆر ناصر باڵی دوەم . بەڵام شێر لە سەروو خواروی عیراقدا زۆر بوەو لە کتێبە عەرەبی‌یەکان‌دا ناوی هاتوە . دوا شێر لە ساڵی ١٨٩٦ ز راوکرا .

چۆن بیسون و فیل و شێر لەناو چوون ئاوەها پڵنگ و پشیلەی کێوی مانگاو ئاسك لە باڵندە نەعامەو جۆرەکانی تر لە ئاژەڵ لەناوچوون . هەمووومان ئەزانین ئاسك ئێستاتووشی چ نارەحەتیەك هاتوە . لە

عیراقدا بەزۆری پێش ٢٠ سال ئەبینرا بەلاَم ئێستا کە خەریکە بەرەو نەمان ئەڕوات ، دوا ئاسك پێش٣ سال لە ناوچەی (سنکرە) لە قەزای (شطرە) بینیم ، بـــە نەمانی ئەم ئاژەڵە گورگ‌و هەندێکی کەش بەرەو نەمان ئەڕۆن لەبەر ئەوەی بە ئاسکەوە بەستراون . زینفون باسی ئەو شوێنانەمان بۆ ئەکا لە ساڵــی ٤٠٠ پ. ز کاتێك لەگەڵ کورشی ئەخمینی لە ئاسیای بچووکەوە بەرەو مەداین هاتوون‌و بینیونی‌و ئەڵـــی.! « وولاَت دەشتێکی فراوانە وەکو دەریا بە دەوەن‌و گژوو گیـا داپۆشراوە . لەو ئاژەڵە کێوی‌یانەی زۆرە کـــەری کێوی‌یە ، نەعامە هەیە ، دوای ئەو ئاسك دێت ، کـە سوارەکانمان راویان نان کەری کێوی پێش ئەسپەکان ئەکەوت دوایی ئەوەستا (لەبەر ئەوەی لـــە ئەسـپ خێراترە) ، کاتێك ئەسپەکانمان لێیان نزیك ئەبوونەوە رایـــان ئـــەکـــردەوە دوایـــــی ئەوەســتان .

سـوارەکانمـــان نـــەیـــان ئزانـــــی راویـــان بکەن تاکو نەبوون بە کۆمەڵی بچووك‌بچووکەوە ، لـە هەموو لایەکەوە بۆیان چوون یـــەك لەدوای یـــەك راوکران . گۆشتی کەری راوکراوو لـە تام‌و لەزەتـا وەکو گۆشتی ئاسك وایە بەلاَم ئەمیان بەلەزەت ترە ». ئەم ئاژەڵە لە بیابانی جزیرەدا تا ئـەم دواییە مایەوە . کنەکەری ناسراو (لیارد) ئەڵی : «گەلەیەك کـەری کێوی‌م لە رێگام‌دا لە سنجارەوە بۆ تلعفر ساڵی ١٨٤٦ بینی . دەڵی ! « لە راکردن‌دا وەکـــو ئاسك وان . پێگەیشتن پێیان زەحمەتە . عـــەرەب بێچوەکانیان ئەخەنە قەفەزەوەو بە شیر پەروەردەیان ئەکەن . لـە رەنگـا وەکو بێچوی ئاسکن . هەتاکو ئێستاش عەرەب گۆشتیان ئەخـــۆن » . لـــە هەڵبەست‌و کتێبـە عەرەبی‌یەکاندا زانیاری زۆر هاتوە لەسەر شوێنگا ، نموونەش بۆ ئەمە یاقوتی حەمەوی‌یە لە (معجم البلدان) دا دەربارەی شاری سنجار دەڵی ! «لە بەردەمی‌یەوە دۆڵێك هەیە ، باخێکی پڕ لە درەخت‌و خورماو نارنجی تیایـە » .

ئەم ئیشارەتە دەری‌ئەخا چی گۆرانێك بەسەر شوێنگای رووەکی دیاری کراوی وەکو سنجار هاتوە . وا دەرئەکەوی بیابانی شام لە کۆنا بە گەلێك جۆر ئاژەڵ دەوڵەمەند بـــوە ، (بەزۆری دۆڵەکانی لە چاخـــی ئەمەویەکاندا ) . کۆشـــکی زۆریـــان بـــۆ راوکردن‌و دوورکەوتنەوە لە ژیانی شار تیا دروست‌کردوە . لەم دواییەدا لە بیابانی کـــەربەلا لـــە شوێنێك نزیك بـــە کۆشکی (اخیضر) کۆشکێکیان دۆزیەوە . لـــــەو کۆشکانەی ئەکەونە بیابانـــی ئەمەویەی کۆشـــــکی (حیەری رۆژئاوا)و (حیەری رۆژهەلات) لە ســوریا ، کۆشکی (حەرانە)و (مەشتا)و (قصیر عمرە)و کۆشکی (الازرق والحلابات) لە ئەردەن . ئەمانـــە هەمووی بەڵگەن بۆ ئەو کاتە بـــۆ زۆری راوکردن ، ئێستا لـە زەوی‌یەکی چۆڵدان بە درێژایی وەرزەکان ژیانی تیـا نیـــە . جوانترین کۆشکیان (قصـــیر عمـرە)یە ، دیوارەکانی لە ناوەوەو دەرەوە بە وێنەی رەنگاورەنگ جوان‌کراوە ، هەندێکیان وێنەی راوی مانگاو کـــەرە کێوی لەسەر کراوە . ئێستاش مانگای کێوی یەکێکە لە حەیوانە بەدەگمەنەکان لە گێتی‌داو گرانترینیانە ، بە کەمی لە یەمەن‌و عمان ماون . دوای ئەوەی هەنـدێ نموونەمان لەوانەی کۆمان‌کردەوە لـــــە سەرچاوەی بەرچاوو ، نووسراو بۆ زانینی شوێنگای کـۆن لـە عیراقدا دا بەدەستەوە . ئەوەی ماوەتەوە باسی لێـوە بکەین سەرچاوە ئاساری‌یەکانە ، ئەمەش پشت بـــە زانیاری کنەکردن‌و هەندێ زانیاری تـر ئەبەســتێت، سـەرچاوە ئاساری‌یەکان لە پاشماوەی رووەك‌و ئاژەڵی هەموو سەدەکان پێك‌هاتوە . لە پاشماوە عوزوی‌یەکان هەڵاڵەی رووەك‌و دارو درەخت‌و گژوگیایە ، باشترین کەرەسەیە بۆ زانینی ئاووهەواو شوێنگای رووەکـــی کۆن . هەڵاڵە لە زۆر شوێندا هەیەو رێ ئەکەوی بــە باشی بمێنێتەوە یان بارێکی خراپــــی بەسەرا بێت . ئەگەر سەردەمەکەی بەهۆی یەکێك لەو رێگا تازانەی وەکو (کاربون ١٤) یان (تحلیل الیورانیوم) دۆزرایەوە ، ئەتوانین ئاووهەواو شوێنەواری سەردەمی هەڵاڵەکە بزانین بە مەرجێ جۆری رووەکەکە کە هەڵاڵەکە بـۆی ئەگەرێتەوە بزانرێت ، رووەك ئەگـــەر هاتـــوو باران‌و گەرماو زەوی‌یەکی مام‌ناوەندی بـــۆ رواندنی نەبـــێ نابێت . مانای ئەوەیـــە ئەگەر هاتـــوو رووەکەکە کـــە هەڵاڵەکـــە بـــۆی ئەگەرێتەوە ناسیمان ئەتـــوانیین مەعلوماتمان هەبێت لەسەر شـــوێنگاکە لە سەردەمی هەڵاڵەکەدا .

بـــەلاَم لەرووی پاشماوەی ئێسقانـــــەوە لێکۆڵینەوەکەی زۆر جۆر رەگەزی حەیوانمان لـــەو چینەی کە تیا دۆزراوەتەوە بۆ دەرئەخات . تـازەترین شت لەم رووەوە روویـــــداوە کنەکردنی بەعسەیەکـی بەریتانیە لە (زام دباغیە) لە بەهاری ساڵی ١٩٧١ . لەم شوێنەدا چوار چینی نیشتەجێ بـــوون دۆزرایەوە سەردەمەکەی بۆ هەشت هەزار ساڵ پێش ئێـستا ئەگەرێتەوە ، ئێسقانەکانی ئەم چوار چینە لایان زۆر گرنگ‌بوو بەگشتی هەی وەرزی دوەمی ئیش‌کردنـی ساڵی ١٩٧٢ کە ژمارەیان (٦٥٨٠) ئێسقانە ، بێجگە لە

زۆر پارچەی تریش . لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم کۆمەڵە ئێسقانەو جیاکردنەوەی ئەو ئاژەڵانەی بۆی ئەگەڕێتەوە تەواوبوو ، دەرکەوت بۆ (١٢) دوانزە رەگەز ئاژەڵ ئەگەڕێتەوە ، لە ٦٥٪ی بۆ کەری کێویو لە ١٥٪ی بۆ ئاسكو بەشێکی کەمی بۆ ئاژەڵی ماڵیکراوی ئەو کاتە وەکو سەگ ، مانگا ، بەراز ، بزن . بەم شێوەیە کنەکردن زانیاریەکی زۆری لەسەر شوێنگای سرووشتی ئەم شوێنە پێش هەشت هەزار ساڵ داینی . بە تەنیا هەلآلەو ئێسقانی ئاژەڵ بەسوود نیە بۆ باسەکەمان بەڵکو خەڵوزو دانەوێڵەی رەشهەڵگەراویش بەسوودە . لە کۆتاییدا هەندی راستی دەستنیشان ئەکەین کە لە باسەکەماندا باسی شوێنگای سرووشتی کۆن لە عیراقدا دەرمانهێناون کە ئەمانەن : ـ

١ ـ زۆر شوێن لە شاخە رووتەکانو دەشتە چۆڵەکاندا کە لەوەو پێش سەوزوو چڕبوونو ئاژەڵ تیا لەوەڕاون ئێستا نەماون .

٢ ـ ئاووهەوا بەشێوەیەکی گشتی لە ماوەی ٥ هەزار ساڵی رابووردو گۆڕانێکی ئەوتووی بەسەرا نەهاتوو . ئەمەش مانای ئەوەیە ئاووهەوا کۆسپ ناخاتە رێمان بۆ دروستکردنی شوێنگایەکی سروشتی بەڵکو یارمەتیدەرێکە ئەگەر هاتوو شوێنگامان لەسەر شێوە کۆنەکەی دروستکرد .

٣ ـ ئەرکێکی پیرۆز چاوەڕێمان ئەکات بەوەی درەختێکی زۆر بڕوێنینو هەندی حەیوان لە بڕانەوەو لەناوچوون رزگاربکەین بە ئامانجی گەڕانەوەی شوێنگا بەبێی باری پێشکەوتنی ئێستا بۆ دیمەنە سرووشتە جوانە رەسەنەکەی .

٤ ـ لێکۆڵینەوە لەسەر شوێنگای کۆن لە سەرچاوەی بەرچاوو ، نووسراوو ئاساریەوە بۆ بووژانەوەی شوێنگا شتێکی زۆر بەنرخو زیندووە پێویستە مەڵبەندێك یان زیاتر لە دانشتگاکاندا دابمەزرێت ، لەبەر ئەوەی ئەم لێکۆلیتەواتە یارمەتیمای ئەدات بۆ نەخشەکێشان بۆ دروستکردنی شوێنگاز بەپێی سروشتە رەسەنەکری کە لەگەڵ ئاوهەوای عیراقو خاکەکەی بگونجێت .

# مشتەری و پاشکۆکانی

● رشید احمد فتاح ●

مشتەری گەورەترین هەساردی کۆمەڵەی خۆرە ، بەپێی دووری لە خۆرەوە پێنجەمینە ، دووری لە خۆرەوە نزیکەی ٧٨٠ کیلۆمەتر دەبێ ، قەبارەکەی ٣١٨ جار لە قەبارەی زەوی گەورەترە ، سووڕانەوەی دەوری خۆی بە ٩ر٥٠ سەعات تەواودەکات ، سووڕانەوەی دەوری رۆژ بە (١٢)ە ساڵ تەواودەکات .



ئەتموٚسفیری مشتەری زوٚر چـــڕەو هـــەور دەوری‌داوە بەشی زوٚری لە گـــازی هایدروجین‌و ئەموٚنیاو میثان پێکهاتووە .

*

مشتەری لە سێ چین پێکهاتووە ، لە دەرەوە بوٚ ناوەوە بەم جوٚرەیە ، چینـــی دەرەوە لە شلـــەی هایدروجین لەگەڵ برێکی کـــەم لە هیلیوٚم‌و ئەموٚنیاو میثان‌و ئاوو ئیثان‌و ئەسیتیلین پێکهاتووە ، چینـــی ناوەڕاســـت لـــە هایدروجینی رەق پێکهاتـــووە ، ئەستووری‌یەکەی ۰۰۰ر۳۸ میل دەبێ ، چینی سێ‌یەم ناوەکروٚکەکەی لە هایدوجینی بەستراو لەگەڵ چەند ماددەیەکی تر پێکهاتووە ، ئەستووری‌یەکەی ۰۰۰ر۱۷ میل دەبێ ئەوەی جێی سەرنجە ئەم چینـــە بەرەبەرە مادەکانی بوٚ تەنە قورسەکانی تر دەگوٚڕین .

چڕی مشتەری ۳ر۱ ی چڕی ئاوە ، ئەمەش بـــوٚ ئەو برە هایدروجینەی دەگەرەێتەوە کە مشتەری لـــێ دروست بووە ، چونکە وەك دەزانین هایدروجین لـــە هەموو تەنەکانی کە سووکترە .

هێزی راکێشانی مشتەری لەچاو هەسارەکانی نزدا زوٚرە ، ئەم هێزە بوٚتە هوٚی تێکدانی خولگەی زوٚر لەو ئەستێرانەی کە بە دەوری روٚژا دەسوورێنەوە ، وە ئەم خولگە تێکدانەی ئەشتێرەکان بوٚتـیە هـــوٚی ئەوەی کـــە ئەم ئەستێرانە وەکـــو هەسارەیەك بـــە رێك‌وپێکـــی بـــەدەوری روٚژا نەسوورێنەوەو ، بـــە مانایەکی تر بڵێین ئەم ئەستێرانە وەکو هەسارەکانـــی تر نابنە هەسارە .

بێجگە لەم ئەستێرانـــە مشتەری گەلێك لـــە کلکدارەکانی (۳) بوٚ لای خوٚی راکێشاوە و کەوتونەتە سەر رووەکەی مشتەری لە هەموو هەسارەکانی تـــر زیاتر شەپوٚلی رادیوٚی دەنێرێتە سەر زەوی ، ئـــەم شەپوٚلانەش سێ جوٚرن ، یەکەمیان شەپوٚلی گەرمی‌یە کە لـــە گەردەکانی نـــاو ئەتموٚسفیری هەسارەکەوە دەردەچێ ، بەلاٚم ئەم شەپوٚلانە لـــە رێگای هاٚتنیا بوٚ لەشێوەی بارگەی کارەبایی‌دایەو لە ئەتموسفیرەکەیەوە دەردەچێ ، بەلاٚم ئەم شەپوٚلانە لـــە رێگای هاتنیا بـــوٚ سەر زەوی پاشکوٚ (۱۰) کاری تێ‌دەکا ، جوٚری سێ‌یەم لەشێوەی شەپوٚلی کورت‌دایە .

مشتـــەری زوٚر خێـــرا بەدەوری خـــوٚیا دەسوورێتەوە ئەم خێرایی‌بەش بوٚتە هـــوٚی ئەوەی ناوچەی پوٚلەکـــان پان ببێتەوەو ناوچەی کەمەرەکـــەی بناوسێ . مشتەری (۱۲) پاشکوٚی هەیە گەورەترینیان ئەو چوارەن کە گالیلوٚ بوٚ یەکەم جـــار بەدی‌کرد .

لەم دوایی‌یە فوٚیجە (۲) ئەو گالیسکە ئاسمانی‌یەی کە ئەمەریکا ناردی بوٚ سەر مشتەری توانی لە پاشکوٚی یوروپا نزیك‌ببێتەوەو وێنەی بگرێ‌و بینێرێتەوە بـــوٚ سەر زەوی ، لەم وێنانەدا رووی یوروپا لە هێلکەیی قلیش بوو دەچێ ئەم قلیشانەش لەشێوەی جوٚگەلەی ووشکان. پانایی هەندێکیان ۳۰ میـــل دەبـــێ‌و قوڵی‌یەکەی ۳۰۰ پێ دەبێ ، زاناکـــان دەڵین رووی دەرەوەی ئەم پاشکوٚیە بەستویەتی‌و رەق‌بووە بـــەلاٚم شەقی بردوەو قلیش قلیش بـــووە . تیرەی ئـــەم پاشکوٚیە ۱۹۵۰ میلە دووەم پاشکوٚی مشتەری (۱۰)ە ، فوٚیجە (۱) توانی بەباشی وێنەی ئەم پاشکوٚیە بگرێت و لەم وێنانەدا ســـەر رووی (۱۰) وا دەردەکەوێ کـــە شاخی بورکانی تێدایێ‌و بورکانەکانیش بەردەوام لـــە تەقینەوەدا بن . ئەم پاشکوێە تا ئێستا هیچ دیاردەیەك نیە کە ژیانی تێدا بێ . تیرەکەی ۲۳۱۰ میل دەبێ .

چوارەم پاشکوٚ لە ریزەوە گانـــــــــیمێدە تیرەکەی ۲۰۰و۳ میلە .

پێنجەم پاشکوٚ کوٚلیستوٚیـــە تیرەکـــەی ۲۰۲ر۳ میلـــە .

**پەراوێزەکن**

۱ ـ پاشکوٚ (مانگ) التابع

۲ ـ هەسارە / الکوکب /

بەو ئەستێرەیە دەڵێین کـــە بـــە رژێمێکی تایبەتی بەدەوری روٚژا بسورێتەوە وەکـــو زوهرەو عـــەتاردو زەوی هتد ..

۳ ـ کلکدار «المذنب»

بەو ئەستێرەیە دەڵێین کە لە پەڵە هەورێکـــی درێژ دەچێت لە ناوەوەی پێشـــەکەی‌دا تەنێکـــی رەق

کوٚمەڵەی خـــوٚر دەژمێرێن بـــەلاٚم ســـورانەوەی خولگەیی‌یان بە دەوری روٚژا شێوە هێلکەیی وەردەگرێ گەورەترینی ئەم کلکدارانە (هالی)یە ساڵـــی ۱۹۱۰ بەدی‌کرا

**سەرچاوەکـــان**

۱ ـ هایدروجینی شل

۲ ـ چینی ناوەوە تەنێکی رەقە

۳ ـ هایدروجینی رەقـــە

# فەلسەفەی زانستی

فەرهاد پیربال

(1)

جیاوازیی نێوان کۆنو نوێ ، جیاوازییێکە لە تێڕوانینی زانستانەی مرۆڤدایە بۆ جیهان ، کە لەمەوبەر ئەم چەشنە تێڕوانینەی نەبووە . « زانیاریی زانستی » مرۆڤی بۆ پایەیەکی دیکە بەرزکردەوە ، کە لە سایەیدا چەند هەنگاوێکی گرنگی لە پێشکەوتنی شارستانیەت هەڵینا .

لەسایەی ئەو زانیارییە زانستییەدا توانی ئەو ماوەیەی کە بە سەدەها سال . نەبڕابوو بە چەند ساڵێك بیبڕێو بەرەو ژینێکی چێتر ، خێراتر هەنگاوبنی .

مرۆڤ چ لە ژینی تایبەتی ، یان کۆمەڵایەتی ، هیچ لایەنێك نیە ، کە ئامرازێکی زانستی تێدا بەکارنەهێنابێ ، یان لە تەنگو چەڵەمەو پێداویستییەك هانای بەر زانست نەبردبی . ئەمەش ڕاستییێکی بەڵگە نەویستە ، کە شارستانیەتو مرۆڤ چەند بەرەوپێشەوە بچن پێداویستییە نوێیەکانیش پتر بە زانستو ئامرازەکانیان بەنددەکەن .

فەلسەفەش لە کۆنەوە ئاوێنەی بیری زانستی سەردەمی خۆی بووە . لە هەر سەردەمێك بیری زانستی تا چ ڕادەیەك بەرزبووبێ ، فەلسەفەی زانستیش تا ئەو ڕادەیە بە تواناو بەرزبووە . کەواتە لە سەردەمی ئێستەشدا فەلسەفە لە بیری زانستی ناترازێو ئەو تاوانە ناکا کە بەدرێژایی مێژوو نەیکردووە ، بەڵکو پتر پشت بە زانستەکان دەبەستێو بە پایەو بەرزیی ئەوان سەرفرازە .

### * چەند تایبەتییکی سەرەکیی فەلسەفەی زانستی :

زۆر لەمێژە زمانی فەلسەفە ئەوە دەکەیەنێ کە چەند وشەیەکی گرانو جیاوازن لەو وشانەی کە زۆربەی خەڵك لێی ڕاهاتوونو قسەی پێدەکەن .

لە کۆن بە شتێکی سەیر نەدەزانرا ئەگەر فەیلەسووف بە بیرو هۆشی لەم گەردوونە ڕابمایە بەو ئامانجەی بە ڕاستییەك بگات ، بێئەوەی لەو تێڕامانە پشت بە چاو ، یان گوێ ببەستێ ، بەڵکو هەر کاتێك کە بە بەهرەی خۆی ڕاستییەکی بۆ ڕووندەبۆوە ، بە چەند واژەیەك دەریدەبڕی ، واتە هەر لە نێو مێشکی خوویدەخواردەوە دوور لە سروشتو دەوروبەر . پاشان دەربارەی سروشتو دەوروبەر ، یان جیهانی دەرەکی دەدواو بەدوای ڕاستییاندا دەگەڕا بۆئەوەی بیاندۆزێتەوە و بنەمایەکی بیرکردنەوەیان بۆ دابنێت . بەرزترین بەڵگەش بۆ ئەو بنەماو ڕاستییە تەنیا ئەوەبوو کە خۆی بە بەهرە پێی گەشتبوو ، ئنجا ئەنجامو ئەنجامی ئەنجامەکانی لێ هەڵدەهێنجاو بە ڕاستو پێکەڵپێکی دەزانی لەگەڵ جیهانی دەرەکی . لە کاتێکدا ئەو فەیلەسووفە نە بە چاو نە بە گوێ نە بە هیچ هەستێك هەنگاوی بۆ ڕاستاندنو ئەزموونکردنی بنەما) بیرییەکەی ئەدەنا ، بەڵکو هەر لە نێو مێشکی خۆی دەسووڕایەوەو بەس .

بەپێچەوانەی ئەم ڕێبازەش فەلسەفەی زانستی

هوردیکاری‌یەکی زۆر بەکاردەهێنێ لە دەربڕینی واژەیەك کە قسە لەسەر دەوروبەر بکات ، یان دیاردەیەکی جیهان ڕوونبکاتەوە ، یان یاسایەکی سروشت دابنێ ، هوردیکاری‌یەك کە فەیلەسووف لە زاناکان نێزیك‌دەکاتەوە ، لە بەکارهێنانی زاراوەی زانستی . لەو کاتەی زانایەك پێناسی وشەی « ڕووناکی » ، یان « دەنگ » دادەنێ ، بەو شێوەیەش فەیلەسووف دەبێ پێناسی ئەو وشە بنەرەتییانە دابنێ کە لە باسی فەلسەفی بەکاریان‌دێنێ . لەخۆڕا نەڵێ « دەروون » یان « گیان » یان « هۆش » یان « چاکە » هەتا هەر وشەیەك لەم وشانە پێناسەیەکی تایبەتی‌ی نەبێ کە لە وشەکانی دیکە هەڵیوێرێ . هەر هێندەش بەس نیە کە فەیلەسووف بڵێ : من فلانە وشە بە فلانە واتا بەکاردەهێنم ، بەو مەرجەی کە خۆی بۆ بەکارهێنانی وشەکە دابناوە ، وەك ئەو فەیلەسووفەی کە دەڵێ :

( من «ماك ــ عنصر » دەناسێنم بەوەی کە لە خۆدا هەیە ) . ئەم جۆرە پێناسەی وشەیە ، تەنها ڕاڤەی ڕێبازی بەکارهێنانی وشەکەیە ، کەواتە ئەو ئەنجامانەی کە لێی هەڵدەهێنجرێن هەرچۆنێك بێ تەنها نێو توێژی پێناسەکە وەدەرنێخێ‌و هیچی‌تر نا .

بەڵام ئەگەر هاتوو فەیلەسووف ویستی ڕادەی بەکارهێنانی وشە فەلسەفی‌یەکان دیاربکات بۆئەوەی کە یارمەتی‌ی‌بدات بۆ ئاسان کردنی باسەکەو هوردیی بیرکردنەوە چاکتر وەهایە لە وشەوە دەست پێ‌نەکات ئنجا پێناسەیەکی بۆ دابنێت ، بەڵکو .. بۆ چەند دیاردەیەك کە لە هەڵکەوت ــ واقیع ڕوودەدەن ، یان چەند ڕەوشێکی بەرهەست کە پێویستیان بە ناولێنان هەیە ، بۆئەوەی لە دیاردەکانی دیکە هەڵاوێردرێن ، ناوێك هەڵبژێررێ ، وشەیەك هەڵبژێررێ ، کە ئەگەر هاتوو پرسیان واتای ئەو وشەیە چیە ، یەکسەر ئەو ڕوودوانە ، یان ئەو ڕەوشانە دەبنە پێناسەی وشەکە ، لێرەدا ئەگەر بێن‌و لەو پێناسە ئەنجامگری بکەین ، ئەو ئەنجامانە پێکەڵپێکن لەگەڵ ڕووداوەکانی هەڵکەوت . کەواتە فەلسەفەی زانستی دەبێ ئەو جۆرە پێناسەیە بکاتە بەردی بناگەی توژینەوەی فەلسەفی‌و .. لەباتی ئەوەی لە وشەوە دەست‌پێ‌بکات ، دەبێ لە واتاوە دەست‌پێ‌بکات تاوەکو کۆتایی‌دێ بە وشە .

جگە لەمە ــ فەیلەسووفی زانستی ــ دەبێ ڕادەی توژینەوەکەی دیار بکات‌و گیروگرفتەکانی بخاتە بەرچاو ، هەروەها بۆ ڕوونکردنەوەی هەر چمکێکی زانستی دەبێ هاریکاری لەگەڵ فەیلەسووفانی دیکە بکا لە شی‌کردنەوەو توژینەوەی فەلسەفی ، وەك چۆن زاناکان هاریکاریی یەکدی دەکەن لە کارگەدا بۆ توژینەوەی بابەتێکی زانستی ، بەو چەشنە سوود لە یەکتر وەردەگرن بۆ دروستیی شی‌کردنەوەی بابەتەکەو گەشتن بە ئامانجی تەواو لە ئەزموونەکەدا .

بەو جۆرە زانیاریان لەو بابەتە برەبرە پتردەبێ‌و دیاریشە کە دوا پلە نێزیکترە لە ڕاستی لە پلەی بە رایسیێ .

بەم شێوەیە فەلسەفە کارێکی دیاری‌کراوی دەبێ لە شی‌کردنەوەی چمکەکانی زانست‌و تێکبەستنی ئەو چمکانە بۆ پێکهێنانی دیمانەیەکی یەکگرتوو کە مرۆڤ‌و دەوروبەر لێکیداتەوەو ڕۆنینییەك بە مرۆڤ ببەخشێ ، بۆ بەکامەرانی ژیان .

## شی‌کردنەوەو لێکدان :

شی‌کردنەوە ، لێك‌کردنەوەو واڵاکردنەوە دەگرێتەوە . لێکدانیش ڕۆنان‌و لێکبەستن دەگرێتەوە .

شی‌کردنەوە لەتوژینەوەدا لێکۆلینەوەی ئەو بابەتانەیە کە ژێر باسن بۆ پارچەپارچە کردنیان بۆ ئەو دانەیانەی کە لێیان پێك‌دێن . چ بیرێك بێ لە مێشك ، چ کێشەیەکی فەلسەفی بێت ، چ دەستە واژەیەك بێ ، چ ڕوودوایێك بێ لە ڕووداوەکانی هەڵکەوت . شی‌کردنەوەیان بۆ ئەو سەرەتایانەی کە بابەتەکە لێیان فراژوو بووە ، لەبۆ ئەو بنەرەتانەی کە بابەتەکان لێیان پەیدابوونیە ، کە بەر هەستێ‌و دەتوانرێ بە چاو ، بە گوێ ببینرێن‌و ببیسرێن . ئەو دراوە هەستیبیانەش کە لەو بنەرەتانەوە هەڵدەتووڵێن بەردی بناغەی بیرکردنەوەن‌و سەرەمووی پێزانین .

لە کۆتایی‌دا ئەوە ڕوون‌دەکەینەوە کە فەلسەفەی زانستی دیمانە ــ یەکی زانستییە لە تێکبەستنی دراوەکانی زانستان ، واتە ئەو زانیارەی کە زانستەکان هەریەك لە دەفری تایبەتیی خۆی پەیدای دەکا بە تێکبەستنیان دیمانەیەکی زانستی پێك‌دێ کە بەردی بناغەی فەلسەفەی زانستییە .

— ٢ —

فەلسەفە بە درێژایی مێژوو ، خۆی لە بیری فەیلەسووفان نواندووە بەگوێرەی پلەی شارستانیەت‌و پێوەندی کۆمەڵایەتی‌و باری زانستیی ئەو کۆمەڵگایەی کە ئەو فەیلەسووفەی تێدا ژیاوە .

مەبەست لە فەلسەفەی زانستی ، ئەو فەلسەفەیە کە لە پێوەندیی نێوان دراوە زانستییەکان « المعطيات العلمية » پەیدادەبێ لە تۆژینەوەی زانایان‌و لێکدانەوەی جیهان لە دیمانەو لایەنی کردەکی زانست . وە هەر زانستێك بەپێی ئەمرازو بۆچوونی خۆی هەرچەند پتر لە بابەتی باسەکە بکۆڵێتەوەو دیمانەی چاکتری بۆ پەیدابکات ، تاکو دەگاتە یاسا گشتی‌یەکان‌و دەستوورانی باسەکە ، پتر هاوبەشی زانستەکانی دیکە دەکا لە گەیشتن بە فەلسەفەی زانستی بۆ رێنماکردنی مرۆڤایەتی بەرەو گۆڕان‌و پێشداچوون‌و فراژوو بوون . ئەم زانستەش چ لە زانستە سروشتی‌یەکانی بێ وەك : فیزیاو کیمیاو ژیناسی‌و .. تد ، چ لە زانستە کۆمەڵایەتی‌یەکان بێ وەك : ئابووری‌و رامیاری‌و .. تد .

وا لێرەدا بەپێی توانا چەند دراوێکی زانستی لێكدەدەینەوە بۆ گەیشتن بە چەند بنەمایەکی فەلسەفی کە لە زانستان هەڵێنجرابێ .

## * شێوەو تایبەتی‌یەکانی مایە مادده

ئەگەر سەیری ئەم جیهانە بکەین سەدان نموونەی جووڵانەوەو بزووتن دەبینین ، چ لەسەر خاك ، چ دەریا ، چ لە هەوا . زیندەوەرەکان مل‌ملانێ‌و ئاڵوگۆڕێکی بێ‌پایان لەگەڵ دەوروبەریان دەکەن بۆ بەردەوامیی زیندەگی ، هەروەك جووڵە لە دیاردە سروشتی‌یەکانی دیکەش دەبینین ، زەوی بەدەوری خۆی‌دا دەسووڕێتەوە هەر لەو کاتەدا بەدەوری خۆریش‌دا دەسووڕێتەوە ، جووڵانەوەی ئەستێرەکان .. تد ، لە هەزاران دیاردە جووڵە ئاشکرایەو خۆی دەنوێنێ ، بەڵام ئاشکرایە کەوا جووڵە شتێك نیە لە دەرەوەی ئەم دیاردانە پەیدابێ ، یان شتێ بێ پتر لە شتانی ئەم دیاردانە ، بەڵکو دەتوانین بڵێین نێوتوێژی ئەم دیاردانەن ، بە واتای : نێوتوێژی ئەم شتانەن کە دیاردەکە پێكدەهێنن .

ئەگەر هاتوو زیندەوەرێك لەگەڵ دەوروبەری لە ئاڵوگۆڕ کەوت ، ئەوا لەنێودەچێ‌و تەنها وەك تەنێکی مردوو دەمێنێتەوە ، کە کۆمەڵێك لە کانەکان پێكدەهێنێ‌و هیچی تر نا ، وێڕای ئەمەش شێوەی زیندەوەریی نامێنێ . کەواتە شێوەیەکی مایە جووڵە پێكدەهێنێ . بەمەش ئەوەمان بۆ ساغدەبێتەوە کە شێوەیەکی تایبەتی‌ی جووڵە ، یان بڵێین جووڵە لە شێوەیەکی تایبەتی‌دا شێوەیەك دەبەخشێ کە تایبەتی‌یەکی هەیە .

بەڵام ئەگەر هاتوو جووڵە لەنێو پێوەندیەکی دیکەدا بێ شێوەیەکی دیکە پەیدادەبێ ، ئەم پێوەندیانەش، لە کارائێککردنی مایە دێنەدی . بەم جۆرە جووڵە نێوی‌توێژی هەموو دیاردەیەکە .

ئاشکراشە کەوا جووڵە بەتەنها ڕاگوێستن نیە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە ، بەڵکو هەموو ئاڵوگۆڕو بزووتنەوەیەك جووڵەیە ، چ بەشێوەی ئامێرەکی بێت ، چ بەشێوەی کیمیایی ، یانژیوەری ، یان کۆمەڵایەتی ..

هەرچەند بەقووڵی لە شێوەکانی مایە بکۆڵوێتەوە ، شێوەی تازەی جووڵە دەدۆزرێتەوە ، هەر بەم جۆرە چەند تایبەتێکی دیکەی مایە دەر دەکەوێ بەم شێوەیە مایە لە گشت شێوەکانیدا لە جووڵەیەکی هەمیشەیی دایە ، بۆ نموونە : ئەو کەسەی بە شەمەندەفەرێك ڕێ‌دەکەوێ .. شەمەندە فەرەکە بەگوێرەی ئەو شارو ناوچانەی پێیدا دەڕوا لە جووڵەیەکی زۆر خێرادایە .. ئەگەر لە تەنی ڕێبوارەکەش ورد بینەوە دەبینین بەگوێرەی ژووری فارگۆنەکە وێستاوە ، لەگەڵ ئەوەش هەردووکیان بەگوێرەی ناوچەکە لە جووڵەیەکی یەکجار خێرادان ، هەروەها تەنی ڕێبوارەکە ـ کە ئەگەر سەیری بکەی ـ چەسپاوو وێستاوە کەچی ـ ئەگەر لێی وردبیستەوەو بە چاوێکی زانستی سەیری‌بکەی ـ هەزاران کرداری کیمیاوی‌و فیزیاویی تێدا ڕوودەدا هەر بەهۆی ئەم کردارانە ـ شە زندوویەتی‌ی خۆی پاراستووەو بوونی خۆی سەلماندووە . ئەم تایبەتیانەی جووڵە ئاڵوگۆڕی مایەکی‌و پاراستنی جووڵەی تایبەتی‌ی تەن‌و هاوگریەتی چەسپانی و پێوەندیی نێوان شێوەکانی جووڵە ، لە دەفری تایبەت بۆ تە مایەی پەیدابوونی گرنگترین شێوەی جووڵە کە تەنی مرۆڤە ، بۆتە مایەی پەیدابوونی هۆش ، کۆمەڵگا ... تد . وە لەئەنجامی چەسپانی هاوگریەتی‌و هاوسەنگی‌و لە کاتی دیاردەکان‌و کردارەکان ، لە

گۆڕانو پەیدابوونو لەنێوچوون ، شێوەی زندەلی‌ی جوولە پەیدابوو کە باڵاترین شێوەی جوولەیە ، بەڵام هەر وەختێ شیکرایەوەو گێڕدرایەوە سەر شێوە سادەکانی – کە پلەی پێکهێنەری ئەم شێوەیەن – تایبەتێتی ئەم شێوەیە ناپارێزرێو هەر کۆمەڵەیەی لە شێوەی جۆێ جوێ پێکهاتووەو هەریەکەیان تایبەتێتی خۆی هەیە .

**شــوێن**

شێوەیەکی دیکەی جوولەیە ، سەربەخۆیی‌و پێکەوەبوونی شتان دیاردەکا ، وە جگە لەوەی کە چۆنیەتی هەبوونی شتان دیاردەکا، شێوەیەکی بوونی مایەشە .

**کــات**

ئەویشیان هەر شێوەیەکی مایەیە، دەبینین هەندێ ڕووداو زووترو هەندێك درەنگتر ڕوودەدەن ، بێنەکیان لەنێواندایە ، کە ئەمەش لە لایەنی گۆڕانو فراژووبوون خۆی دەنوێنێ . بەم جۆرە کات لایەنی بوونو پەرەسەندنی مایە دیاردەکا . شوێن لەباری بەرزیی‌و درێژی‌ڕیانی دەردەکەوێ . کات لەباری ڕابردووو ئێستاو داهاتوو ، هەر بەم پێیەش لەسەر یەك ڕێبازدا دەڕواو بەپێچەوانەی ئەم ڕێبازەش ڕوو نادات . کەواتە کاتیش شێوەیەکە لە شێوەکانی مایە .

کاتو شوێن دیاردەی بابەتەکین، یەکسەر بۆ هۆشو هەستی مرۆڤ خۆ دەنوێنن ، شتێکی خۆیەکی نین .

مایە بە هەموو شێوەکانی شوێنو کاتو جوولەو .. تد ، هەمیشەیی‌یتو بەردەوامنو لەنێو ناچن، بەڵکو لە شێوەیەکەوە دەگۆڕێن بۆ شێوەیەکی دیکە ، لە هەبووندان بێ کۆتایی .

مایە بوونی خۆی نانوێنێ لە دەفری کاتو شوێن نەبێ شوێنو کاتیش هەبوونیان نیە بەبێ مایە ، کەواتە هەموو بێ دوایبەکین ، واتە ناتوانرێ دوایی بۆ مایە بدۆزرێتەوە، لە کاتێکدا شوێنو کات بەردەوام بوونی ئەو دەسەلمێنن ، دیارە بەردەوامیی ئەوە دەگرێتەوە کە لەنێوان هەر «دوو کاتێك»دا دەرفەتێك هەیە کە ئەو دوو کاتە بەیەك دەگەیەتی ، لە نێوان هەر دوو شوێنێکیش درێژایی‌یەك هەیە کە ئەو دوو شوێنە بەیەك دەگەیەنێ، کەواتە مایەش بەردەوامەو بێ دوایبە .

بەم جۆرە بچکەلەترین بازی مایە کە ئەتۆمە ، هێزو وزەیەکی ناوەکی خۆی هەیەو بنجی پێکهاتنی مایەن ، پرۆتۆنەکانو ئەلکترۆنەکانو نیۆترۆنەکان کە پێکهێنەری ئەتۆمن ، کارلێكدەکەن لە خوولی توخمەکاندا پاشان لە خوولی گازو شلەمەنییەکانداو تەنە ڕەقەکاندا تا دەگاتە زەوی‌و ئەستێرەو کۆمەڵە ئەستێرەکانو یەڵە هەورییەکان . بەم جۆرە ئەتۆمەکانو ئەو بارگە کارەباییانە بە بنجی پێکهێنەری زندەگی‌و گەردوون دەژمێررێن لە دەفری لێکۆڵینەوەی زانستی . کارلێكرکدنی نێوان ئەم هێزانە بۆتە هۆی بوونیان بە شێوەیەکی تایبەتی ، کە ئەگەر لە جوولە کەوتن شێوەیان تێكدەچێو نامێنن . هێزانە شێوەکانی جۆراوجۆری کەواتە جوولەو کارلێك کردنی ئەم مایە پەیدادەکەن .

بە جۆرە زانستەکان لە واتای مایە کۆڵینەوەو .. یاساکانو شێوەکانی مایەیان دەستنیشان کرد ، هەروەها چۆنیەتی گۆڕانو پێشکەوتنی. وە وەدەریان خستووە کە مرۆڤ تەنها بوونەوەریشکی ژیاری – بایۆلۆجی نیە ، بەلکوو بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتیشە . ئەندامەکانی لە ئەنجامی کارو گۆڕانی مێژوویی مرۆڤ ، لە ئەنجامی گونجانی لەگەڵ مەرجەکانی هەبوون ، ڕۆڵێکی تایبەتی‌ی دیوە لە بەرەو پێشچوونی‌و پتر پەیدا – کردنی هۆشو زانیاری . کەواتە زانستە کۆمەڵایەتییەکانیش لە تەك زانستە سروشتی‌یەکان یارمەتی‌ی مرۆڤ دەدەن لە ڕامکردنی سروشتو زاڵبوون بەسەر تەنگو چەڵمەی ژینو پێزانینی یاساکانو دەستووره کۆمەڵایەتییەکان . تاوەك ئامرازێکی کاریگەر لەڕێی ڕامەکردنی سروشتو بە کامەرانی ژینی مرۆڤ بەکاربهێنرێن بۆ بەرەو پێشەوەچوون و گۆڕان .

**سەرچاوەکانی :**

١ – نحو فلسفه علميه : تاليف: د. زكي نجيب محمود . الطبعه الاولى ، ١٩٥٨

٢ – مجله – تراث الانسانيه – المجلد الثاني . العدد الثالث. مقاله: نشاه الحياه على الارض . بقلم انور عبدالحليم

●

سرنج : بۆ بەکارهێنانی زاراوە زانستییەکان ، سوود لە «گۆڤاری کۆڕی زانیاریی کورد – بەرگی چوارەم – ساڵی ١٩٧٦» وەرگیراوە

# شانۆی گریك

**سەرەتا**

لەم باسەدا ئاوڕ لە لایەکی هەرەگرنگی هونەری شانۆ دەدەمەوە ، ئاوڕ لەو توخمە سەرەکییە مێژوویەی پەیوەندی بنەرەتی بە ڕۆژانی چاوهەڵهێنان و نەشونمای هونەرەکەوە هەیە ، بریتییە لە شانۆ یان ساختمان و هونەری خانوکاری شانۆ ــ

مەبەست لەو جێگاو شوێنەیە شانۆنامەی تیا نمایش دەکرێ و بینەرانی تیادا کۆدەبێتەوە ، ئاوڕدانەوەمان لەم لایەنە گرنگە دەبێتە مایەی ئاگاداربوون و شارەزایی بە بنچینە سەرەکییەکانی ئەم هونەرە پایەبەرزەوە و خوێندنەوە و بەسەرکردنەوەی توخمێکی پێوست کە لە مەوداکانی تەواوکردن و گەیاندنی نامە و مەبەستیا کاردەکات ، هەر لەمەشەوە ئاگاداری شێوەو جۆری سەرهەڵدان و لەدایك وون و گووڕی هەنگاوەکانی سەرەتای دەبیسن ، زانینی رادەی کاریگەریتی و جێگاو شوێنی لە دڵ و دەروونی جەمەودرانی ئەوروژگاردی ژیانی گریكدا ، کەواتە بەخۆڕایی نەبووە مامۆستایەکی وەك (فرانك ــ م ــ هوایتنج ــ ) لەم بارەیەوە ووتویەتی : ( شارەزابوون بەهونەری خانوکاری شانۆکارێکی ڕەواو پێوستە بۆ هەر کەسێ بیەوێ لە هونەری شانۆ بکات و جێژی لێ وەربگرێ ) . (١)

**نووسینی احمد سالار**

## شوێن پێهەڵگرتن و چوونە سەر سەرچاوە

بۆ گەیشتن بە زانینی دروستبوونی شانۆو جۆری دروست کردنەکەی پێوست بە دۆزینەوەی ڕێگا دەکات تا بگەینە مەبەست ، هەر چۆن زۆربەی زۆری زانایانی مێژووی دراما لەسەر ئەو رایە یەك کەوتوون کە یەکەم جار شانۆ کاتی بووە بۆیە باری سەرنجییان بردۆتە سەر هێندێ شتی دی لە پێناوی ڕاستبوونەوەی ئەو سەرەتاو دروستبوونەدا ، ئەوەتا زۆربەیان سێ چاوگیان دەستنیشان کردووە بۆ شوێن پێهەلگرتن لە پێناوی دۆزینەوەدا ، بریتین لە کۆنە پارچە سیرامیك و تێکستە کۆن و شوینەوار و پاشماوەکانی شانۆی گریك بۆیە ( دکتۆر عبدالمحسن الخشاب ) یش بەوپەڕی برواوە دەڵێ : ( پشت بەو سێ سەرچاوەیە دەبەستین چونکە هەر لە سەرەتاوە شانۆ یۆنانییەکە کاتی بووەو لە ڕۆژانی سازکردنی دوو ئاهەنگە ساڵانەکەی دیۆنیزیۆسدا دروست دەکراو پاشان نەدەما ) . (٢)

لێرەدا ئەو سێ ڕێگایە بەسەردەکەینەوە تابزانیین ئایە تا چ رادەیەك دەمانباتە سەر مەبەست ، ئەو سێیانە سێ یادگاری ئەو ڕۆژگارەی بەرەبەیانی جیهانی درامان ، دەگەرێنەوە بۆ سەدەکانی پێنج و چواری بەر لەدایكبوونی مەسیح .

یەکەمیان بریتییە لەو پارچە سیرامیکە کۆنانەی یادگاری ئەو سەردەمانەن و ماونەتەوە ، لە مۆزەخانەکانی یۆنان و میسرو قوبرس و ایتالیادا بەرچاو دەکەون .

لەسەر ئەو قاپ و قاچاغە فەخفورییانە گەلێ وێنەی بینراوی شانۆیی تیا نەخشێنراوە و بێی رازاوەتەوە لەو بەرهەمی گۆزەگەرییانەوە ڕەنگورووی شانۆکان دەبینینەوە ، بۆ نموونە لە یەکی لەو پارچە ( سیرامیك) کانەدا ، لەسەر سەرقاپەکەی بەشێوەی وێنەی زبرو دیار شێوەی بینراوی شانۆیی دەنوێنێ ، شانۆیەکی دیۆنیزیۆسیانە ، کەسانێکی شانۆکار بە دەمامکەوە قوربانی گاو کەل و پەل و توخمی دیۆنیزیۆسانە ، وەك هێشوەترێ ، پایە و کۆڵەکە دیکۆر دەگەێنن .







دەبان نموونەی وامان لەبەر دەستایە ، ئەگەر پرسیاری ئەوەش راستبێتەوە کە هۆی چی‌یە ئەم کێشە شانۆگەری‌یە لە گۆزەگەریا دەژیا ؟ دەلێین (دراما) وەك دیاردەیەکی دیاری سەردەمەکەو وەك تقوس و عەنعەناتێکی ئاینەکە ، وەك کارو کردەوەیەکی دیاری ژیانەکەیان رەوابرو جێگای بایەخ و گرنگی پێدان بێ ئەوساش وەك ردنگدانەوەی ئایدیای سەردەم و رەنگدانەوەی ئەفسانەو بۆچوونەکان و گەلێ هۆی دی وای لێ‌کردبوو شایستەی ئەو نەخشاندنەبوو ، هەر بەهۆی ئەو لایەنە ئاینی‌یەوەیە گەلێ لەو پارچە سیرامیکە گرنگانە لەپەرستگاو شوێنە پیرۆزو مەزنەکاندا دادەنران .

دووەمیان بریتی‌یە لەو گەنجینە بەنرخەی یادگاری بیرو خامەی مەزنە پیاوانی هونەری درامایە ، وەك کەلتووریکی گرنگی شاعیرانی ـ گریك ـ وەك بە رهەمەکانی

ئەسکیلیۆس –
( ٥٢٥ پ – ز – ٤٢٩ پ . ز ) و
– سۆفۆکلیس –
٤٩٧ پ – ز – ٤٠٦ پز
یوریپوس

– ( ٤٨٠ پ . ز – ٤٠٦ پ . ز ) و
– ئەرستۆفانیس –
– ( ٤٥٠ پ . ز – ٣٨٠ پ . ز ) ی
هونەرمەندی کۆمیدیا .

بەخوێندنەوەی ئەو تێکستە شانۆیی‌یانە شاردزای شوێن و شانۆیەکان دەبین ، ئەو شانۆیانە ئەو تێکستانەی بۆ نووسراوە ، وەك شتێکی ئاشکرا – دراما – دەنووسرێ بۆ نمایش‌کردن ، بۆ پێشکەش‌کردنی سەر شانۆ .

**ئەمە ئەو دەردەخات کە نووسەرە شانۆیی‌یەکە بە چاکی ئاگاداری ئەوە‌یە کە ئەوەی دەینوسێ دەبێ هێندەی بارو تواناو شیوەی شانۆکەیێ ، چوار چێوەیەك هەیە نووسیەکەی تیا رابگرێ ، کەواتە لە رەنگ‌وڕووی ئەو تێکستە یادگارانەوە شانۆکەی ئەوساکەمان دێتە بەرچاو ، ئەمە لەلایەکەوە وەك حەقیقەتێ لە لایەکی دی‌یەوە ئەو هەموو هێماو رێنومایی‌یە شانۆیی‌یانەی تیایانا دەبینرێتەوە ، سەرجەم دەروازەیەکی شاردزابوونی چاکمان بۆ دەخاتە سەر گازی پشت .**

سێیەم سەرچاوە چاوساغمان بریتی‌یە لەو شانۆ دێرینانەی وەك یادگارێ ماونەتەوە ، ئەو شوێنەوار و پاشماواتە بە روون و رەوانی بۆمان دەدۆزێ ، لە گەلێ شارو ناوچەکانی ولاتی (گریك) دا بەرچاو دەکەون ، دەیان شانۆی وەك شانۆی (ئەپیدۆرس – ) دەبینین .

## شانۆی گریك

لەتەك پەرەسەندن و تەشەنەکردنی هونەری ( دراما ) دا گۆرانکاری یەکی یەکجار زۆریش لە ساختومانی شانۆدا رووی‌دا ، تا کەوتە سەر دۆخی خۆیی‌و رەنگ‌وبۆی تەواوەتی رشت ، ئەو شێوەیەی بووە باو و لە ناوچەو جێگاکانی ولاتی یۆنانی یەکگرتوودا لاسایی دەکرایەوە ، ئەو نەخشەو شێوەیەی بە شانۆی گریك بەناوبانگەو لە جهانا دەناسرێ . خاوەنی مۆرك و دەستووری تایبەتی‌یە ، لێرەدا دەست‌نیشانی بەشە سەرەکی‌یەکانی ئەو شانۆ دێرینە دەکەین : –

**١ – سیاترۆن –**

ووشەیەکی کۆنی یۆنانی‌یە و لە فەرمانی ووشەی – سیۆمیاوە

وه هاتووه بەواتای ــ دەبینێ ــ مەبەست لەشوێنی بینینەوە ، واتە جێگای دانیشتنی بینەران کە ئەمڕۆ پێی دەووترێ هۆڵی بینەران ، هــەر لــــەم ووشەیەشەوە ووشەی تیاترۆ ش کــە خانووی شانۆ دەگەیێنێ کەوتۆتەوە .

بۆ ئاسانی دروستکردنی ئەم بەشە گرنگــەی شانۆ ، هەمیشە گردوو گردۆلکەیان بەکار دەهێنــا ، ریزەکانی دانیشتنی بینەرانیان تیــادا ئەتاشــی و سازدەکرا ، لەسەرەتاوە تەختەیان لەســـەر دادەنــا پاشان لەبەر کەم بەرگەگرتنی گۆڕا بەتاشە بــەرد ، بێگومان ریزەکانیش لەشێوەی نیوە بازنەدا دەبوون ، ئەوەی سەرنجڕاکێشە کورسیەکانی ریزی پێشەوەیە کە جێگای دانیشتنی گەورەپیاوان بووە ، وەك گەورە کاهنی دیۆنیزیۆس و ســـــەردار و سەرکردەکان ، بالوێزی ولاتانی بێگانە . بەهێندێ نەخش و نیگــار و نووسین رازبوونەوە ژمارەی کورسی ئەم ریــزەی پێشەوە نزیکەی شەست کورسی دەبوو .

**٢ ــ دیازۆما ــ**

ــ واتە رارەوی نێوان ریزەکانی بینەران ، بۆ هاتووچۆکردن .

**٣ ــ ئۆرکسترا ــ**

ئەو زەویی‌یە تەختە شێـــوە بازنی‌یە کە دەکەوێتە بەردەم یەکەم ریزی بینەران هەر لە سەرەتاوە شوێنـــی (کۆرس) بـــووە و سروودی تیــا ووتراوەتەوە و سووڕی تیادراوە ، ئــەمە ئــەوە ناگەیێنێ کە ــ کۆرس ــ هەرگیز نەچووبێتە ســـــەر سەکۆی شانۆ بەڵکو هێندێ جار وای پێویست دەکرد سەر کەوێتە سەری .

درێژای تیرەی بازنەی ئۆرکێسترای شـــاری ئەسینای سەدەی پێنجەمی (پ.ز) شەست پــێ‌یە ، پێ‌یە ، وەك نەریتێ لەناوەراستی ئەم ئۆرکێسترایەدا قوربانی‌گایەکی بەردین بۆ دیۆنیزیۆس دروست دەکرا ، پێیان دەووت ( سایمیل ــ ) ئــەمــە پەیوەندی بە مەسەلە ئاینی‌یەکەوە هەیە .

**٤ ــ لۆجیــۆن ــ**

واتە سەکۆی شـــانۆ

ئەمە لەتەك پەیدابوون و گرنگی کاری ئەکتەردا هات و گرنگی پێدرا ، بنەکەی لە بەرد درووست دەکـــردو سەرەوەی تەختەبەند دەکرا . بوونی ئــەم بەشـــە پەیوەندی سەرەکی بە گەیاندنی دەنگ و بینینەوە هەیە لەگەڵ کزبوونی رووناکی سەر کۆرس بایەخی ئـــەم سەکۆیە برەوی بوو .

لە سەرەتاوە چەند پلە یەك لەتەختایی ئۆرکسترا بلندتربوو بەلام تەماشادەکەین لە سەدەی چوارەمینی (ث.ز) دا بەرزای سەکۆی شانۆ گەیشتە دە پێ ، ئەمە بەلگەی بۆپێشتەوەچوونی بوونی ئەکتـــەرە ، بـــە ئاوڕدانەوەیەکمان لە شانۆنامەکانی شاعیرانی (گریــك) ئـــەم راستی‌یەمان بـــۆ دەردەکەوێ ، شاعیـــری درامانووس (ئەسکیلیۆس) کاتێ شوێن‌پێی (تسپیس)ی یەکەم ئەکتەری هەلگرت ، ئەکتەری دووەمی هێنــا ، بەلام هێشتا کۆرس گەلێ شتبـــوو ، تەماشـــــای شانۆنامەی (پارسەکان) و (نزاکاران) بکەین ئەوســـا (کۆرس) ی لێ لابەین بەتاڵ دەبێتەوە ، دوای ئەم لەلای (سۆفۆکلیس) ئەو گرنگی و بایەخەی نەما ، تەماشــا شانۆنامەی (ئۆدیبۆس بە پاشایی) ، بەم جۆرە ، لەلای (یۆربیدس) کەمتردەبێتەوە ، تەماشـــــای (ئەفجینــا لەئۆلیس) بکە . ئەم‌گرنگی‌دانە بە سەکـــۆی شانـــۆ بەرامبەر کەمبوونەوەی گرنگی ئۆرکسترا رادەوستی‌ە بۆیە لەسەردەمی (هێلالی) دا بەرەو پچووکبوونــە وە چوو تا لەلای (رۆمانی) یەکان چووە شێوەی نیـــوە بازنـــەوە .

**٥ ــ سکیسنی ــ**

ووشەیەکی یۆنانی‌یەو (چـــادر) دەگەیێنـــێ ، لەسەرەتاوە چادرێك لەپشت سەکـــۆی شانـــۆوە هەلدەدرا ، شوێنـــی جـــل‌وبەرگ و کەل‌وپـــەل و ئارایشت و حەوانەوەی ئەکتەران‌بوو . جگــەلەوەی هاوبەشی شانۆیی دەکرد وەك (دیکۆر) ، پاشان کــرا بە ژووری دارینە ، دوایی بـــە بەرد دروستدەکـــرا ، دەرگا و پەنجەرەی تیابوو بۆ هاتووچۆ بەکار دەهێزاو هاوبەشی کارە شانۆیی‌یەکەش پێ دەکرا ، جگە لەوەی لەرووی دەنگ گەیاندنا دەوری هەبوو بـــە دانەوەی دەنگی ئەکتەران بە گوێــێ بینەراندا . لەبەردەم ئــەم خانوودا چەنـــد پایەیەك هەبـــوو پێیـــان دەووت (پرۆسینیۆم ــ ــ ) ، ئەمەش وەك دیکۆر هاویەشی دەکرد .

**٦ ــ پاراسینیا ــ**

وەك دوو باڵی شانۆ بەرەو دواوە .

ئەو شەشی بەشەی باسمان کردن ، دادەنرێن بـــە پێکهێنەرە سەرەکی‌یەکانی شـــانۆی یۆنانی ، هێنـــدێ

جار بە وردەکاری یاز،زیا کردنی پایە و سەکۆ و تاقی سەر دەرووی هات وچوو گۆڕانێ کرابێ، بەڵام ئەوەندە گرنگ نەبوون و بەبەشی سەرەکی ئاژمێرێن بۆیە ئیمەش بەسەرمان نەکردوونەتەوە .

**قۆناغەکانی شانۆی گریك**

بەپێی ئەو گۆڕانانەی بەسەر شانۆدا هات دەتوانین بەچوار قۆناغ دابەشی بکەین ، وەك لای خوارەوە : ــ

**یەکەم :**

سەردەمی (پیزستراتۆس ــ ) ی فەرمانڕەوای زۆرداری شاری ئەسینا ، واتە بەر لەداهاتنی سەدەی پێنجەم (پ.ز) ، لەم قۆناغەدا ئۆرکسترا لەچەقی بازاری گشتی (ئەجوار) دادەنرا و بینەرانیش لەسەر پلیکانە دارینە (ئیکریا) دادەنیشتن ، پاشان لەقوربانی گاو پەرستگای پیرۆزی دیونیزیۆس‌دا بنیاد نرا .

**دووەم :**

سەردەمی (ئەسکیلیۆس) ی شاعیری دراماتوس و سەرەتای پەیدابوونی (سوفۆکلیس)، لەم قۆناغەدا لە گۆڕەپانی شاردا ئۆرکستراو سەکۆی دارینە و دیواری پشت سەکۆ هاتە گۆڕێ و دیواری بەدەورا هەڵچنرا .

**سێیەم :**

ناوەدەبری پەرۆژانی ئاسایش و ئاشتی ، لەم قۆناغەدا هۆڵی بینەران و پایە و باڵی شانۆ تەواوبوو .

**چوارەم :**

سەدەی چوارەمینی (پ.ز) ، ئەو رۆژگارەی (لیکورجۆس ــ ) ی ووتاربێژ شانۆیەکی بەردینی بنیادنا و ئەوە (بولیکلایتۆس ) شانۆ بەناوبانگەکەی شاری (ئەبیدرۆس) ی بنیادنا ، لەم سەردەم و قۆناغەدا شانۆی گریك گەیشتە دوا پلەی باڵا .

**تەواوکەرەکانی شانۆی گریك :**

هەر وەك زانراوە گەلێ ئامیرو کەلوپەل لەکاتی پێشکەش کردنی شانۆیی‌یەکاندا بەکار دەهێنرا ، بەڵام سێ ئامێر هەبوون کە لە گشت شتەکانی دی بایەخدار تربوون ، وەك سێ کەرەسەی گرنگ و پێوست بۆیە بەرەوام زانی لێرەدا ناویان بەرم ، ئەو سێ ئامێرە بریتی بوون لە (ئەکسکیما ــ
ئەمە مێزێکی دارینەی نزم‌وو لەسەر رەورەوە دەڕۆی ، لە کاتێکا دەهێنرا کە بینراوی یان رووداوێ نەبوایە لەبەر چاوی بینەران رووبدات ، وەك کوشتن کە لەپشت (سکینی) یەوە دەبوو ، ئەوسا لەسەر ئەم (ئەکسکیما) یە دەهێزایە سەرشانۆ .

ئامێری دووەم (پریاکتوس ــ
یان پێ دەووت لە شیوەی (منشور) ێکی سێ رووی بوو ، زانایانی مێترووی (دراما) بۆ ئەوە دەچن کە ئەم ئامێرە لە کاری (دیکور) دا دەوری دیووە ، لەسەر هەر رووەی وینەیەك لە وێنەکانی دیکۆرەکە کێشتراوە و بە پێی پیوست بەکار هێنراوە ، وەك دێکۆری ئاسان جوولە . ئامێری سێیەم (میکانا ــ
یە دەوری (سلنگ) ی دەبینی لە بەرزکردنەوە و هێنانەوە خوارەوەی ئەو کەس و کەرەسانەی دەبوو بەو جولاندنەوەیەیا بڕۆن ، وەك هێنان‌و بردنی خواوەندەکان .

**شانۆی کۆن و چەند حەقیقەتێك :**

چونکە پەیوەندیەکی بنەڕەتی لەنیوانی شانۆو تێکستی دراما و ئەکتەرو بینەرو ئایدیای سەردەمدا هەبە بۆیە هەر کە ناوی یەکێ لەو کەرەسە سەرەکییانەمان برد لە باسی ئەوانەی تریشەوە دەگلێین و کاتێ بە خۆمان دەزانین تێکەڵمان



کردوون ، چونکه یــه هەموویان خانوویەکی مەبەست دروست دەکەن، بۆ راستی ئەم واتەیەمان ئەوە بەیــاد دەکەینەوە کە هەر کاتێ نووسەر شانۆنامەی نووسیووە شێوەی شانۆکەی هێناوەتەوە بەرچاوی ، ئــــەم حساب‌کردنە بۆ سێ یەکانەکان (الوحدات الثلاث) کــە (ئەرستۆ) لە باردی (دراما) وە دەستنیشانی کردوون.

کاتێ ئەکتەر دێتە پێشەوە حسابێ بۆ پێشەکەی کراوە کە لە شانۆیەکی وا گەورەدا کە نزیکەی بیست هەزار کەسی تیادایە نمایش‌دەکا ، ئیتر ئەمــە دەنك و جولاندنەوە و کەرەسەکانی دی‌یە . بــۆ مەسەلــەی بینەران ، خۆ ئەوە هەر تەماشایەکی شانۆیەکی ئـــەو رۆژگارە پێمان دەلێ چ جەماوەرێکی بێ‌شماری هەبووە لە هەر دوو سەردەمەکەی شانۆدا ، واتە رۆژانی کــە ئاینی بوو ، رۆژانێکیش کە دونیایی بوو ، بــــــە هەرحـــــال بــەم کورتە باســـە رەنگە توانیبێتمان یادیکی ئەو رۆژانەمان کردبێتەوەو زانیبێتمان چ باســـە .

**سەرچاوەکان**


١ ــ شلدون تشینی ــ تاریخ المسرح في ثلاثـــه الاف سنه ــ ترجمه درینی خشبه ــ مراجعه ــ علــی فهمی ــ وزاره الثقافه والارشاد القومی ــ قاهره ــ

٢ ــ فرد ــ ب ــ میلیت ــ و ــ جیرالد ایــدس بنتلی ــ فن المسرحیه ــ ترجمـــــه ــ صدقـــــی خطاب ــ مراجعه ــ الدکتور محمود السمــره ــ دار الثقافه ــ بیروت ــ عام ١٩٦٦ .

٣ ــ فرانك ــ م ــ هواتینج ــ المدخل الی الفنون المسرحیه ــ ترجمه کامل یوسف ــ بــــدر الــدیب ــ د. رمزی مصطفی ــ محمود السباعی ــ درینی خشبه مراجعه ــ حسن محمود ــ سعید خطاب ــ تقدیـــم سعید حطاب ــ قاهره ــ ١٩٧٠ .

٤ ــ د. عبد المحسن الخشاب ــ تیاترو القــدیم ــ قاهره ــ ١٩٧١ .

٥ ــ الهامی حسن ــ المسرح الاغریقی ــ مجلـــه المسرح العدد العاشر السنه الاولــــی ــ اکتوبـــــــر ــ ١٩٦٤ ــ قاهره .


**تێبینی .** حەزدەکەم خوێنـــەری خۆشەویست ئاگاداری ئەوە بێت کە خۆم ئەو شوێنەوارە دێرینانەی وڵاتی .. گریکەرم دیوەو بــەوردی سەرنجم‌داوە بـــۆ بەهێزکردنی ئەم نووسینەم .

**ا ــ سالار**

# کورتە باسێك لە بارەی ژیان و هونەری



# شارلی شابلن


**وەرگێرانو ئامادەکردنی :**
**حسین احمد جاف**


رۆژی (٢٥)ی کانونی یەکـــەمی ساڵی (١٩٧٧) یەکێك لە ئەستێرە گەشەکانـــی جیهانـــی هونـــەری ڕاستەقینە لە شاری جنیف‌دا کــۆچی دوای‌کــرد .. ئەو هونەرمەندە مەزنەش (شارلی شابلن)ی ئەمربوو. جا لەم چەند دێڕانەی لای خوارەوە لە بارەی ژیان‌و تێکۆشانی ئەم هونەرمەندە گەورەیە کورتە باســـێك دەخوێنینەوە ..

شارلی شابلن له سالی ١٨٨٩ له شاری لەندەندا له دایك بووەو هەتا ئێستا هیچ ڕوون نەکراوەتەوە له بارەی دایكو باوکی ، تەنانەت ئەوە نەبێت که دوو ئەکتەری هەژاری نەناسراوبوون . تەنانەت شارلی شابلن خۆیشی .. حەزی نەدەکرد زۆر لەسەر ئەم خالە بدوێت. بەلام ئەوەش زانراوە که شارلی سبنسر شابلن دوو سالی دوورو درێژو پڕ له ناهەمواری له یەکێك له مەلبەندەکانی هەتیوان یەخێوکردن ( ملجا الایتام ) له شاری لەندەندا بردووتە سەر .

به تایبەتی ڕۆلەکەی شابان زۆر جوانو سەرنج ڕاکێشەربوو . دوا به دوای ئەمە .. شابلن لەگەل یەکێ له ئەکتەرەکانی ئەو تیپە تێك چوو .. منیش ئەمەم به هەل زانیو خێرا بانگم کردو پەیوەندیەکم لەگەلدا بەست که له فیلمێکی کۆمیدیدا هاوکاری لەگەل ئێمەدا بکات ، ئەو کاتە تەمەنی شابلن(٢٤) سالبوو . ویەکەم فیلیمی شابلنو سینیت .. فلیمێکی کورتی کۆمیدی بوو ناوی (سازاندنی کۆزەران) بوو .. وە بەم جۆرە به جووتە دەها فلیمیان سازدا وەکو الصعلوك (ڕووتە ١٩١٥) و جادەی (ئاساز، ١٩١٧) و (هەلگرتنی چەك ١٩١٨) و (تاریکی ١٩٢١) (کەژچکردوو ١٩٢٣) ، (ئالتون، ١٩٢٥) ، (ڕووناکیەکانی شار ١٩٣٠) (سەدەکانی نوێ ١٩٣٢) بەلام ڕەخنەگرانی سینما .. هیچ چەشنە گۆڕانێك لەم فیلمانەدا نابینن .. هەرچەند شابلن توانی (شخسیەتی) ئەو (ڕووتەیە)زیاتر قوول بکاو پەرەی پێ بدات .. تا وەکو جلو بەرگی ئەو (ڕووتە) یه وای لێهات کەواتایێکی تایبەتیو قوول ببەخشێ . شابلن توانی دژایەتی (تناقض) له نێوان جلو بەرگی کۆنو شڕو دەولەمەندی ئێجگار بێ ئەندازە پێشان بدات .. بەو شێوەیەکە دێتە پێش چاوی مرۆڤی هەژارو لێقەوماو ئاوارە بخاتە بەرچاوی خەلك .. هەروەهاش توانی نارەزاییەکی ئازایانە (رفض شجاع) له نێوانی ئەو فیلمانە دەربڕێ که دژ به ڕاستیە تالەکانی ژیانن وەکو (نەبوونیو داماویو کەم دەستەلاتی) . شارلی شابلن پاش دەرهێنانی ئەو فیلمانە وای لێهات که ببێت به نموونەیەك بۆ هەموو چەوساوەکانی ژیان نەك تەنها له ئەمریکاو ولاتانی ئەوروپای ڕۆژئاوا بەلکو له هەموو جیهانداو له هەموو ساتو زەمانێکدا . بەلام ئیتر ئەوە بوو که پاش دەرهێنانی کۆمەلی (جەنگاوەرانی پێشو) (المحاربون القدماء) به ئەو پەڕی توندیەوەدژی وەستانو داوایان کرد ئەم فیلمە قەدەغە بکرێت ... ئیتر ئەوە بوو که

پاش سالێك کۆمپانیەکانی دابەشکردنی فیلمی سینمایی .. فیلمەکەیان ڕاکێشاو له لیستەی دابەشکردندا سڕیانەوە هەروەها :. هەمان هەنگاویشیان بەرامبەر به فیلیمەکانی دیکەی وەکو (ئالتون)و (ڕووناکیەکانی شار) وەرگرت ، هەر چەند ئەم فلیمە . له هەموو ڕووێکەوە .. یەکێکە له فیلمە هەرە گرنگو هەرە سەرکەوتووەکانی (شابان) .

هەر له سەرەتاوە .. واتە لەو ڕۆژەوە پێی ناوەتە ناو (هولیوود)ەوە ، کەپایتەختی سینمای جیهانە .. شابلن بڕوای بەوە نەبوو که ڕژێمی سەرمایەداری .. بەرهەم و هەموو ئاواتەکانی هونەرمەندێکی پێشکەوتوخواز وەکو شابلن خۆی ناهێنێتە دی چونکە فیلم .. سەبارەت به هولیود که ڕستەیە نەك هەلوێستو ئیستودیۆش کارگەیە .. ئەم کارگەیەش هەر بەو شێوەیە ئەبێ بگێڕێت وەکو کارگەکانی تر هیچ چەشنە جیاوازیێك واتە وەکو کارگەی شەکر یان ئوتومبیل یان جگەرە .. جا بۆیە هەموو چەشنە تەگەرەو کۆسپێك .. ڕێگەی لەو هونەرمەندە پێشکەوتنخوازانە ئەگرێت . کەوا هاتنە هولیود بۆ ئەوەی شتێکی مرۆڤانە پێشکەش بکەن .. بۆ نموونە فیلیمی (ڕووناکیەکانی شار) شابلن به جارێ وازی له ڕۆلی (ڕووتە) هێنا .. چونکە هەستی بەوە کرد که چەرخ بەرەو گۆڕانێکی گرنگ ئەڕواتو فیلیمی (دکتاتوری گەورە) دوا فیلیمی زنجیرەی ڕووتەبوو . له سالی ١٩٤٧دا شابلن فیلیمی (مستر فیردو)ی دەرهێنا . لەم فیلیمەدا .. شابلن ڕەخنەیەکی توندو تیژی ئاڕاستە به کۆمەلی ئەمریکای سەرمایەدار دەکاو زۆر له نەریتە پیسەکانی ئەو کۆمەلە سەرمایەدارەی خستە ڕووەوە .

لەو فیلیمەدا باسی (تاوانبارێك) دەکا چەند پیاوێکی کوشتووە . ئەو تاوا نبارەی بەرگری له خۆی دەکا ، له بەردەم دادگایەكو چەند (بەلگەیەك) بۆ خۆی دەدۆزێتەوە ودەلێ ئەم کۆمەلە .. کۆمەلێکی چۆن چۆنیە ؟ ئەو کەسەی که پیاوێك دەکوژێ به تاوانبارو خوێن ڕێژ دادەنرێت بەلام ئەوانەی که ملیونەها کەس دەکوژن کەس بەو چاوەوە سەیریان ناکاو پەنجەی تاوانباریان بۆ درێژ ناکات ، هەرهەمان (تاوانبار) تاوانباری هەموو سەرۆکەکانی ئەو کۆمەلە دەکا که له هەموو ووتو وێژیکیاندا (هەڕەشە به هەلگیرسانی چەنگ دەکەن) هەروەها ئەوانەش به خەتابار دادەنێ که چەك دروست دەکەن بۆ نەهێشتنی مرۆڤ .. لەم

فیلمە شابلن ویستی هەموو کەسێك لە کۆمەڵی ئەمریکا هوشیار بکاو بیجوڵێنێت .. جا لە ڕاستیدا توانی بگاتە ئەم ئەنجامەو هەستی میللەتەکەی بخرۆشێنێ ... دژ بە کۆمەڵی سەرمایەداریو چەوساندنەوە . بەڵام کۆمەلە ئاینیەکان ایزنیشتین دەرهێنەری (زریپۆشی بۆتمکین) و نورسو... یلـ... دەرهێنەری (هاونیشتمان‌کین) و دەیان وەکو ئەمانە کە توشی هەموو جۆرە بەرهەلستیو بەربەرەکانیەك بوون لەلایەن کۆمپانیاکانی هزلیودو نەیانتوانی لە پایتەختی سینما ئیش بکەنو فیلمەکانیان بەجێ بهێنن . تراژیدیای شابلن لەگەڵ پایتەختی سینما ..

ئەمجا بە هاوبەشی لەگەڵ ئەو هونەرمەندەدا کۆمپانیایەکی تایبەتی دامەزراند لە ژێر ناوی (کۆمپانیای هونەرمەندە یەکگرتوەکان) .. دوا بە دوای ئەوەش ، ئەم هەنگاوەیان ، توشی تەنگو چەلەمەی زۆر هاتن . چونکە سینمایەکان وەکو پارچەیەك لە ڕژێمەکەی هولیود ڕێگەی پیشاندانی بەرهەمە هونەریەکانی کۆمپانیاکەی (شابلن) یان نە ئەدا .. ئەوە بوو کە ڕێگەی پیشاندانی فیلمی ــ ڕووناکیەکانی شار ــ نەدرا . لێرەدا ئەم پرسیارە دێتەکایەوە .. ئایا بۆ چی بەم شێوە نالە بارە دامو دەزگاکانی هولیود بەرەو ڕووی فیلیمەکانی شابلن ئەبوونەوەو بەرهەلستی‌یان دەکرد؟. وەلام ئەم پرسیارەش لام وایە زۆر زەحمەت نی‌یە ؟ چونکە شابلن وەکو هونەرمەندێکی سەرکەوتوو شێوازێکی تایبەتی خۆی هەبوو بۆ پێکەنینی خەڵك .. ئەم شێوازەش (اسلوب) زۆر جیاوازە لە ودی ئەکتەرە ئاساییەکان .. چونکە شابلن خاوەن هەلوێست بووو بیروباوەری وابوو کە ئەگەر بە شێوازی (برنارد شۆ) بێ خەلك پێ دەکەنێنێ .. گاڵتە بە دەولەمەندە سەرمایەدارەکان دەکا .. گاڵتە بە خاوەن کارگە گەورەکانو کۆمەڵی دەرەبەگ دەکا . هەروەها بەو کەسانەی کە هەردەم لە پێناوی ڕووخاندنی هێمنیو ئاشتی لە ژیاندا هەوڵ دەدەن . هولیودیش وەکو مەسەلەیەکی سروشتی لەو کۆمەڵەدا ــ بەستراوە بەو ڕژێمە پیسەو سە بە ئیمپراتوریەتی ڕۆژنامەگەریو کە بەستراوە بە (بورصە)ی (نیویورك)ەوە .. بەستراوە بە هەموو پیشەسازە گەورەکانی ئەمریکا .. ئایا هولیود دەتوانێ بە هەموو ئەمانە (تضحیە) بدات لە پێناوی هونەرمەندێك .. هەچ هونەرمەندێك هەتا وەکو ئەگەریش ئەو هونەرمەندەش (شابلن)ی مەزن بێ ؟

لە سالی (١٩٤٧)دا لە نێوان بەزمو ڕەزمەکەی ماکارثی لێژنەی چالاکیەکانی دژ بە ئەمریکا (لجنة النشاط المعادی لامریکا) حەند تاوانێکی سەیری ئاراستە کرد بە هەندێك لە ڕۆشنبیرانو هونەرمە ــ ندانی ئەمریکا . تەنانەتیش چەند هونەرمە ــ ندیکیش لە وانەی هولیود هاتنە پێش ئەو بەدناوە بو شاهیدی (الشهادة)ی لە بەردەم ئەو لیژنەیە ئەکتەر روبرت تایلر ووتی : شابلن پیاوێکی مەترسی لێ‌کەرە . ئەدولفە مینگۆ وتی : پیوستە شابلن دورخرێتەوە بۆ بیابانی تیکساس چونکە بیری چەپڕەو بلاو دەکاتەوە . پێش ئەوەی لیژنەی ناوبراو داوای بکات .. شابلن بروسکەیەکی ڕەوانەکرد وتی : بیستومە نیازتان وایە .. بانگم بکەن بۆ ئەوەی پرسیارم لێ بکەن من چەپڕەوم یان نا ؟ منیش بە ڕوونی پێتان دەڵیم کە من مرۆڤێکی پێشکەوتنخوازم ئاشتی خوازم ..

کۆمپانیای هونەرمەندە یەکگرتوەکانیش کە خۆی‌یەکێك بوو لە دامەزرێنەوەکانی . نەیتوانی دابەشی بکا . ولە (١٨)ی‌ئەیلولی سالی (١٩٥٢)دا.. شابلن ئەمریکای بەجێ هێشتو بەرەو ئەوروپا ڕێگەی گرت .. تەنها یەك ڕۆژی پاش ئەوە واتە لە ڕۆژی (١٩)ی ئەیلولی سالی (١٩٥٢)دا شالیاری دادپەروەری ئەمریکا وتی : بۆمان دەرکەوتووە .. کە شابلن پیاوێکی مەترسی لێ‌کەرە ئەگەر گەڕایەوە ئەدرێت بە دادگاو .. ڕەوانەی بەندیخانە دەکرێ .. لەو ڕۆژەوە تاوەکو مرد .. شابلن نەگەڕایەوە ئەمریکاو لەسویسرا خانوویەکی کڕیو لەگەڵ خێزانەکەی لەوێ جێگیربوو . ئینجا فلیمی (پاشا لە نیویورك) لە سالی ١٩٥٧و فیلمی (خانمێك لە هۆنك کۆنگ)و سالی ١٩٦٧ .. دەرهێنا کە تاکە فیلمی ڕەنگاو ڕەنگیەتی . شارلی شابلن نەك تەنها فلیمەکانی دەنووسیو دەریشی دەهێنا .. بەڵکو ئاوازی بۆ گۆرانیەکانی دادەناو مۆسیقاکەش بۆ هەلدەبژاردو لە ڕۆژی (٢٥)ی کانوونی دووەمی سالی ١٩٧٧ .. شابلن کۆچی دوای‌کرد سلاو لە یادی «شابلنی نەمر چونکە تێکۆشەرێکی جیهانی بوو لە پێناوی ژیانێکی پڕ لە خۆشیو سەربەستیو ئاشتی بۆ هەموو گەلانی ئەم جیهانەگەورەیە .. بۆ هەموو ئادەمیزاد » .

**سەرچاوەکان**


١ ــ ئینسایکلۆبیدیای بریتانی ــ بەرگی سێهەم

٢ ــ اوتوبیاگرافیای شابلن

٣ ــ سکرین ماگازین ژمارەی یەکەمی کانوونی دووەم سالی ١٩٧٨ .



# نەتەوایەتی موسیقا

نوسینی ئەنور قەرەداغی

گۆرانی میللی یان فۆلکلۆری یەکێکە لەو هۆ راستانەی کە هەن بۆ دەربڕینی باری ژیانی ئەو میللەتە کە پڕە لە ئاوات و هیواو حەسرەت، ئاوێنەیەکی راستگۆیە کە خۆشی و ناخۆشی تیا بەدی ئەکرێ بە ووشەیەکی سادە و ئاوازێکی ساکار و ئاسان .

گۆرانی میللی یان فۆلکلۆری باشترین وەسفی رووداوەکانی کۆمەڵ لە هەموو کات و زەمانێکا ئەکا لە ناو لادێدا بێ یان لە ناو شاردا و لە هەموو لقەکانی تری هونەرە جوانەکان لە ناو کۆمەڵدا باوترە چونکە لە بەر ئاسانی و سادەیی و ساکاری ووشە و ئاوازەکەی بە زوویی بڵاو ئەبێتەوە، لە بەر ئەوە هیچ دوور نیە کە بە ئاسانی کار بکاتە سەر مرۆڤێکی سادەی ناو کۆمەڵ و زوربەی کات لە بەتاڵی و کاتی ئیش کردنیا بەسەر دەمیەوەبێ .

میللەتی کورد وەك ئاشکرایە لێمان خاوەنی کەرەسەیەکی هونەری یەکجار زۆرە کە بەسەر شاخ‌وداخی کوردستاندا ووتراوە و باسی ئاواتی خەڵکی ئەکا بۆ نیشتمانەکەی ، هەروەها باسی دلداری و ئەفسانە و کارکردن ئەکا و تیایا لاواننەوە و ئازایەتی و چەندەها جۆری تر لەم بابەتانە باس ئەکا .

بێ‌گومان، ئەم گۆرانیانە دەماو دەم لە باوباپیرانمانەوە بۆمان ماونەتەوە و چەندەها دەوریان دیوە و گۆڕانیان بەسەردا هاتووە هەتا گەیشتووەتە ئەوەی کە ئەمڕۆ ئەی بیسین و چەندەهای تریش فەوتاون و نەماون و نەگەشتوونەتە لامان .

زۆر کەس هەن ، دان نانین بەوەدا کە مۆسیقا لایەنی نەتەوایەتی تیایە ، یان بەشێوەیەکی تر بڵێین دان بە (نەتەوایەتی مۆسیقا ) دا نانێن ، بەو بیانوەی کە ئەڵین مۆسیقا زمانێکی جیهانیە و ئاوازێکە تەنها کار ئەکاتە سەر هەستی مرۆڤ ، پێیان وایە مۆسیقا یان بەشێوەیەکی جیهانی ئەبێ یان میللیە و تەواو ، ئەڵێن کە نەتەوایەتی پەیڕەوێکی رامیاریە زیاتر لەوەی کە گیانێکی هونەری بێت ، یان بەو بیانوەی کە ئەڵین ، نەتەوایەتی هەرگیز ئاوەڵ ناوێك نەبووە بۆ زانیاریە مۆسیقیەکان ، ئەم جۆرە رایانە هەرچەندە دەر ئەبڕری ؛ بەڵام زۆر گوێی پێ‌نادرێ لە ناو کۆڕە مۆسیقیەکاندا ، وە زۆریش لە سەریان ئەڵێن بەوەی کە ئەم جۆرە کەسانە پێویستی‌یان بە کاتێکی زۆر دوور و درێژە بۆ تێگەشتنی ئەم چەمکە ، لێرەدا زۆر ناتوانین بچینە ناوەرۆکی تەواوی ئەم لایەنەوە بەڵام بەکورتی تەنها دەست نیشانی هەندی لایەن ئەکەم لەم رووەوە ..

وەك لەناو خۆماندا ئاشنایە و لە زۆر بەرهەمی گەورە پیاوان و زانایانی مۆسیقا لە جیهاندا دەبینین شێوەی نەتەوایەتی مۆسیقاژەن و دانەرەکانی راپیچ کردووە و بە ئاشکرا دیارە ، قوتابخانەیەك بەناوی قوتابخانەی شێوەی نەتەوایەتی لە مۆسیقادا سەری هەڵداوە وەك لێی ئەدوێین .

یەکێك لە زانا گەورەکانی ئەمریکا کە ناوی (راڵف والدون ئیمەرسۆن )ە دەڵێت ( رۆژێك دێت سۆزی ئەوروپایی لاچێت و سۆزی ئەمریکی جێگای بگرێتەوە ) . ئەوەی ئەم زانا گەورەیە مەبەستیەتی ئەوە ئەگەیەنێ وەك خۆیان ئەڵێن ... کە ئاواز و گۆرانی گەلێك توانای

بەهێزترە بۆ گەیاندنی شێوە و جۆری ژیان بە تایبەتی ئەتوانێ چێژی میللەتێ بگەیەنێتە میللەتێکی تر ئەمەش بەکار هێنانی ئاوازو مۆسیقاو گۆرانی بە ووشەی تایبەت و ئامێری تایبەت و لێدانێکی تایبەت لە جێگاو شوێنێکی تایبەتدا و بە پەروەردە کردن بە جۆرە ژیانێکی تایبەت .

زۆرمان نەك لە مۆسیقادا بەڵکو لە ئەدەبیش‌دا گوێمان لە بەرهەمی جیهانی دەبێت لە چیرۆك و ئەفسانە و هۆنراوە و پەخشان ، گەر بەچاوێکی وورد و زانیاری لێی بکۆڵینەوە هەرچەندە ناوی جیهانی‌یە بەڵام لە کەل ئەمەش‌دا گیانی نەتەوایەتی تیایە کە لە بیری ئەو نووسەرەوە چەسپاوە کە لەو خاکەدا ژیاوە و ئاو و هەوای ئەو ناوچەی هەڵمژیووە و بە خوو و رەوشتی کۆمەڵایەتی ئەو گەلە پەروەردە بووە .

قسەکردن لە بارەی شێوەی نەتەوایەتی مۆسیقا لە دوایی‌یەکانی سەدەی نۆزدە هەمدا دەستی پێ کرد .

( کارل ئەنجل ) لە سالی ١٨٧٩ ز دا ووتوویەتی ( بابەتی نەتەوایەتی مۆسیقا رەنگە زۆر سەیرو سەمەرە بێت لەلای مۆسیقارە هاوچەرخەکان ) ، هەر لەسەر ئەم قسەیە زۆر ووتراو و زۆری خستە ئەندێشەوە تەنانەت ( کالفورکوریسی ) سالی ١٩١٤ بەکورتی لەم بارەوە دواوە و ووتوویەتی (مەسەلەی نەتەوایەتی مۆسیقا زۆری لە رەخنەگران، و مێژوو نووسەکانی سەرسام کردووە) ئەڵێت ( شۆپان یەکەم کەس بووە کە ئەم جۆرە قوتانجانەیەی خولقاندووە .

کەلە پیاوەکانی رۆمانسیی لە سالی ١٨٤٣ ز بۆیان دەرکەوتووە کە ئەو میللەتانەی دەوری ئەلەمانیایان داوە هەولی رزگار بوونی خۆیان داوە و نایانەوێ لە ژێر چەپۆکی ئەلەمانیادا بن ، واتە نایانەوێ رووەکانی ژیانی ئەلەمانیا کاریان تێ بکا لە وانەش ( مۆسیقای ئەلەمانیە) هەر کەسێ لە بەرهەمەکانی (برلیوز و شۆپان و گلینکا ) وورد ببێتەوە و لێی بکۆڵێتەوە لە سەر رەگەزە نەتەوایەتی‌یەکان ، بەئاشکرا هەست بە گیانی نەتەوایەتی ئەکا کە زۆر بەزەقی تیایا دیارە ... ئەم دانەرە مۆسیقیانە لە گیان و سروشتی گۆرانیە فۆلکلۆری و میللیەکان کە لە وولاتەکانیان‌دا باو بووە ، کاری تێ‌کردوون و ئاوێتەی ژیانیان بووە .

گۆرانی میللی بەلای ئەمانەوە وە لە راستیش‌دا هەروایە .. هەست و نەستی دەروونیە کە لە وولاتێك‌دا و لە کاتێکی تایبەت‌دا پەیدا دەبێ ... سەرچاوەی ئەم هەست و نەستانەش هەر ئەو شوێنەوارەیە کە تیا ژیاون و چاویان تیا کردوەتەوە .

باری ژیای کۆمەڵایەتی لە بەینی میللەتان‌دا جیاوازی هەیە ، کەواتە گۆرانی میللیشی لە میللەتێکەوە ئەگورێ بۆ میللەتێکی تر ، وەیان ئەتوانین بڵێین ، گۆرانی میللی کە لە میللەتێکی تێروتەسەلەوە هەڵئەقولێت جیاوازی زۆرە لەو گۆرانی‌یە میللیەی کە لە کۆمەڵێکی ژێردەستە و هەژار و ژێر چەپۆکەوە سەری هەڵدابێ .

لێرەدا ئەتوانین بڵێین کە ئەو جۆرە گۆرانیانە ئاوێنەیەکی واستەقینەی دەربرینە کە تیشکی

گەشی یان کزی باری ئەو کۆمەڵە ئەداتەوە .

مۆسیقای میللی دوو نەتەوە با دراوسێش بن توخم و رەگەزی تایبەتی خۆیان هەیە کە لە یەکتریان جیائەکاتەوە وەك مۆسیقای میللی کوردی و عەرەبی وەیان مۆسیقای هیندی و چینی وەیان مۆسیقای دەولەتەکانی ئەورووپا ... ئەو جیاوازیەش بە گوێ گرتنێکی زۆر و وورد هەستی پێ ئەکرێ .

ئەم جیاوازیە بەچاکی لە کاری مۆسیقاژەنە گەورەکان‌دا دیارە ، وە لە هەمان کات‌دا زۆریش هەیە بێ ئەوەی خۆی هەستی پێ‌بکا ئەچێتەوە ناو هەمان شێوە و رەگەزی نەتەوایەتی لە مۆسیقاکەی‌دا .

بۆیە ئەڵێم چاکترین مۆسیقاژەن یان دانەری ئاواز یان گۆینده ئەوانەن کە بە قوولی چوبێتنە ناو هەست و نەستی نەتەوەکەیانەوە وەك هەر ئەدیبێك یان مرۆڤێکی ئەو میللەتە کە لە گەل جۆری ژیانیا بتوێنەوە بۆ خزمەت‌کردنی رەگەزی نەتەوایەتی بە گشتی و بەتایبەت مۆسیقا .

گەربێتو گوێ‌یەك شل بکەین بۆیەکی لەو مۆسیقا جیهانیانەی کە هەن ( بۆ نموونەش سیمفونیەی پێنجەمی بتهۆڤن ) هیچ گومان ناکرێت کە ئەم کارە هونەریە لە خۆی‌دا کارێکی هونەری زۆر گرنگە و هەروەها کارێکی مرۆڤایەتی زۆر گرنگیشە ، ئەم مۆسیقایە لە هەردوو ئەو رووەوە واتە هونەری و مرۆڤایەتی نرخێنراون .. مەبەستمان، لێرەدا قسەی ( ئارثر فیروبال )ە کە دەڵێت ( کە ئێمە دەڵێین مۆسیقا ، دەبێت مرۆڤایەتیش پشت‌گوێ نەخەین ، چونکە مۆسیقا تێکەڵ بە

نەتەوایەتی و هەست و بیرو ویژدان، چونکە مرۆڤ ئەو توخمە بلندەیە کە تێکەڵە لە هەست و بیرو ویژدان .

نابێ بە مۆسیقاش بوترێ کە کارێکی هونەریەو بەس بەڵکو ئەبێ لایەنی مرۆڤایەتیش شان بەشانی کارە هونەریەکە بروات لە هەموو دانراوێکی مۆسیقای جیهانیدا ، چونکە هەر کەسێ مۆسیقای حەزلێ کرد ئەم حەزەی کاری تێ دەکا ، ئەم حەزو خۆشەویستی‌یەش ئەوەیە کە پێی‌دەڵێن مرۆڤایەتی . مرۆڤایی‌یەتیەکەش بە توندی بەستراوە بەلایەنی نەتەوایەتی مۆسیقاکەوە .

لەم رووەوە برنادشۆ ئەڵێ ( ئەگەر ویستت نەتەوەیەك بناسیت گوێ شل کە بۆ مۆسیقاکەی) ئەمەش دان پیانانێکە لە دووتوێی ئەم قسەیەدا کە هەر نەتەوەیەك مۆسیقایەکی هەیە تایبەتە بە مۆرکی خۆی ، تایبەتە بە رەنك دانەوەی هەموو لایەنەکانی ژیانی ئەو کۆمەڵە و گۆرانی و ئاوازانەی کە هەن لە ناو ئەو میللەتەدا .

لێرەدا چەند نموونەیەکی مێژوویی ئەهێنمەوە لە سەر ئەو گۆرانەی کە بەسەر ژیانی مۆسیقادا هاتووە و بزانین کە هەندێ لەو وولاتانەی کە ناودارن لە جیهانی مۆسیقادا وەك ئەلەمانیا و ئیتالیا بۆ نموونە چ گەنجینەیەکی گەورە و سائێکی فراوانیان پێك هێناوە کە بەراستی جێگای شانازی هەموو جیهانە وە لە زوربەی زۆریدا شێوەی نەتەوەیەتی لە مۆسیقایاندا دیارە و ئاشکرایە .

ئیتالیا وەك ئەزانین یەکێکە لە وولاتە پێشکەوتووەکانی ئەورووپا لە رووی هونەری مۆسیقاوە ، تەنانەت قوتابخانەی تایبەتی لەرووی مۆسیقاوە هەیە .

ئەم وولاتە هەتا ساڵی ١٨٧٠ ز وولاتێکی پارچە پارچە بوو ، هەر پارچەش لەم وولاتە سەردارێك حوکمی کردووە ، لەگەڵ ئەمەشدا کە رۆشنبیری چاوی تیا هەڵهێنا لە هەموو هەرێمەکانیدا وەك یەك وابوو ... مۆسیقاش کە هاتەکایەوە ، لە بناغەی سەرەتاییەوە گۆرانی (فەلاحەکان ) بوو . لە ناوەراستی سەدەی سیانزەهەم هەتا سەدەی پانزەهەم چینێ لە چینەکانی کۆمەڵ کە بە (تروفاتوری) ناو ئەبرا بە چالاکی خۆی دەنواند ، لە پێشا بە گۆرانی فەلاحەکان ، دوایی بە گۆرانی میللی بە جۆرێك کارێکی وەهای کرد رێگەی خۆش کرد بۆ سەر دەرهێنانی گۆرانی خۆشەویستی کە پێیان ئەووت سرودی خۆشەویستی ئەمەش بە (مادریگال) نادرابوو ، کە لە کۆتایی‌یەکانی سەدەی شانزەهەم دا بوو . بێ‌گومان هۆنراوەش لەگەڵ مۆسیقادا دەست لە ملان بوون و شان بە شانی یەکتر ئەرۆیشتن هەتا ( ئیتالیای نیشتمان ) زەق ئەگەشایەوە .

شاعیری بەناو بانگ (دانتی) لەم لایەنەوە هاتەکایەوە پاش ئەویش (پیترای) وە زۆر لە دانەرەکان ئاوازی ئەو شاعیرانە و چەندها شاعیری هاو چەرخی خۆیان بۆ دائەدا ، بەم جۆرە هەر بەردەوام بوو هەتا بیردۆزی یان تیوری هەمە دەنگ لە مۆسیقادا سەری‌هەڵدا واتە (پۆلیفونی) . ئیتر لەو کاتەوە مۆسیقا بە قوناغەکانی مێژوویی‌دا دەروات .

لە سەدەی چواردەهەمەوە هەتا سەددی شانزەهەم ستایشی کەنیسی چاوی هەڵهێنا و گۆرانی داهێنرا، ئەمەش لە سەددی پانزەهەم دابوو . لە سەدەی پانزەهەمدا لە لایەن (پترارك) نوسینەوەی موسیقا داهێنرا وە گۆڕانێك هات بەسەر سرودی خۆشەویستی‌دا (ماردیگاڵ) وە ئامێری کەمان و هاوچەشنەکانی وەك ( فیولا و فیوانسیل (چلو) و کۆنترباص ) هێنرانە کایەوە ، ئەمەش لە سەدەی شانزەهەم و حەڤدەهەمدا بووە . ئۆپێرا و گۆرانی شانۆیی لە سەدەی حەڤدەهەمدا سەری هەڵداو ( باسی ژمارەدار ) لە هارمۆنی‌دا هاتە کایەوە وە بۆ دوو سەدە دانەری خۆی هەبوو کە ئاوازیان لە سەر دائەنا .

بەم جۆرە گۆرانی بە ( تەنها و پلیکاتو) لە سەدەی حەڤدەهەم و هەژدەهەمدا گۆڕانی بەسەردا هات، پیانۆ فۆرتی لە سەدەی هەژدەهەمدا داهێنرا ، بەم جۆرە ئیتالیا ئەو گۆڕانە هونەریەی بەسەردا هات .

زاناکانی مۆسیقا ئەڵێن کە گەلێك لە زروفی کۆمەڵایەتی و ئاینی و رامیاری و تەنانەت جوگرافی و مێژووی راستەو خۆ پیاوی دروست کرد و دانەری چاکی هێنایە کایەوە بە جۆرێك مۆرکێکی تایبەت بدات بەو مۆسیقایە کە پێی ئەڵێن (مۆسیقای ئیتالیایی) .

وەك چۆن ئەم گۆڕانە بەسەر مۆسیقای ئیتالیایی دا هات هەروەها هەمان گۆڕانیش بە سەر زۆر لە میلەتانی تریشدا هات و گیانی نەتەوایەتی لە مۆسیقایاندا بە ئاشکرا دیارە وەك لە گۆرانی و مۆسیقای ئیسپانیدا گیانی نەتەوایەتی هەستپێ دەکەین ، ئەویش بەهۆی ئەو زروفە

مێژوویی‌یە و کۆمەڵایەتیەوە کە تیا ژیاون ، بەتایبەت کە لە لایەن ئیسلامەکانەوە ئیسپانیا داگیرکرا ، ئەوەی کە ماوەتەوە لە هونەری سەدەی هەشتەمەوە هەتا سەدەی پانزەهەم شتێك لە هەوێنی ئیسلامی و عەرەبی لە هونەریاندا هەست پێ ئەکرێ ، بەتایبەتی لە بەشی خوارووی ئیسپانیادا .

بەم جۆرە ئەتوانین ئەو جیاوازیەی لە شێواز و مۆرکدا ئەبیسرێت لە ئاواز سۆزدا لە وولاتێکەوە بۆ وولاتێکی تر لە کاری دانەرە گەورەکاندا بەدی بکەین . وەکو لە پێشەوە باس‌مان کرد کە (شۆپان) یەکەم کەس بوو کە لە بەرهەمی‌دا شێوەی نەتەوایەتی تیا بەدی ئەکرا ، چونکە بەگیان و هەست وَ رۆشنبیری ئەلمانیەوە مەلاشووی هەلدراووەوە ، بەلام لەبەر ئەوەی کە شۆپان لە بنەچەدا پۆلەندی و فەرەنسی بوو ، بۆیە لە بەرهەمی‌دا بۆنێکی پۆلەندیشی تیا هەست پێ ئەکرێ ، بە تایبەتی لە مۆسیقای هەلپەرکێ و سەمادا ، هەروەها تێکەلە بە سوکەلەیی و بۆشناخی فەرەنسی‌یەوە .

لە بەرهەمەکانی (لیست)ی هەنگاری‌و (سمێتانا) و (دفورجاك)ی بۆهیمی و (گریك) ی نەرویجی و (گلینکا) و (بالاکیریف) و (بوردوین) و (مۆسورجکی) و (ریمسکی و کۆرساکۆف) لە روسیادا، (ئەلبانیر) و (گرانادوس)و (فالا) و (کورینا) لە ئیسپانیادا ، بەتەواوی گیانی نەتەوایەتی لە بەرهەمەکانیاندا دیارن .

لە ئینگلترەش‌دا گیانی نەتەوایەتی لە مۆسیقادا بە ئاشکرایی سەری دەرهێنا ، کاتێ (باری) کە ئینگلیزی بوو (ماکینری) کە اسکوتلندی بوو (ستانفورد) کە ئیرلەندی بوو بەرهەمی مۆسیقایان بە جوانی پێشکەش ئەکرد و تام و بەرامی نەتەوایەتی‌ی تیادا بەتەواوی دیاربوو ، چونکە بواری ئیشەکەیان گۆرانی جوتیارەکان بوو .

لە فلندەش بەرهەمەکانی (سبلیوس) زیاتر لە هەموو بەرهەمێکی تر بە خەستی گیانی نەتەوایەتی تیا دیارە . ئەمریکاش بەرەو نەتەوایەتی ملی نا و گۆرانی قولە رەشەکان و هیندیە سوورەکان کران بە بناغەی ، پاش ئەوەی ئەمانە بوون بە بەشێك لە کۆمەلی ئەی‌مەریکا .

لە وولاتی عەرەبستانیـ‌ر بەهەمان شێوە نەتەوایەتی بە ئەکرێ وە هەروەها لە وولاتانی چین و هیندستان و یابان ... هتد ..

لەم باسە کورتەی کە کردمان دەبینین گیلقی نەتەوایەتی سەری لە هەموو میللەتانی جیهاندا هەلداوە ، بە تایبەتی لەو وولاتانەی کە پێشکەوتنێکی گەورەیان لە مۆسیقادا وەچنگ هێناوە ، توانیویانە کە لوپووری مرۆڤایەتی زیاد بکەن کە چێگای ستایش و رێز لێ نانە .

هەندێ رای تازە دەلێت بەتایبەتی لەم سەدەی بیستەمەدا کە گیانی نەتەوایەتی لە مۆسیقادا بەرەو کپی ئەروات ، ئەمەش کاتێك کە هەموو گەلانی جیهان دەبن بەیەك خێزان و یەك دەولەت و مێشکی مرۆڤ بەرەو ئەوە ئەچێت ئەم کۆمەلگا گەورە بەختیار و شادمان بێ .. ! بەلام ئەلێین هەرچۆنی بێت هێشتا جیهان نەبووە بەیەك خێزان و نەش بووە بە یەك دەولەت ، هەر میللەتەو هەر سەرۆکە لە رێرەوی خۆیەوە بۆ سەربەزری و شادمانی و کامەرانی میللەت و نیشتمانی خۆی هەول ئەدات .



ئەم گرنگی‌یە بە نەتەوایەتی مۆسیقا یەکێکە لەو پایە بەرزانەی کە میللەت بەرەو پێشەوە بەرێ و جۆری ژیانی ئەو میللەتە بناسێن بە میللەتانی تر . مۆسیقای کوردی لە خۆی‌دا مۆسیقایەکی پاکی پێ‌گەردە ئەگەر چی هەندێ لە هونەری عەرەبی و فارسی و تورکی بەهۆی باری ژیانی رامیاریەوە کاری تێ کردووە ، بۆیە ئەلێم لەمەوبەر دانەری مۆسیقای وامان نەبووە وەیان بە مانای دانەری مۆسیقای کوردی هەر نەبووە .. دەبا لە بەرهەمە تازەکاندا کە لەلایەن دانەرە وکردەکانەوە دائەنرێن ئەو توخم و رەگەزە نەتەوایەتیانەی تیا وون نەکەن و لە سەری برۆن بۆ ئەوەی هونەرێکی پاکی نەتەوەیی ،خولقێنین دور لە لاسایی‌کردنەوەو چاولێ‌کەری ، ببێتە ئاوینەیەکی روون کە دەروون و هەستی میللەتەکەمانی تیایا بۆ نەوەی داهاتوو و میللەتانی تر پیشان بدەین .

پێویستە ئاگاداری کەلوپوری

میللەتەکەمان بکەین و بیـــــان نووسینەوە و هەست و نەست و سۆز و کروزەی بــاو باپیرانمان نەبەلین وون بێـــت بۆ ئـەوەی سیمای راستی میللەتەکەمان بخەینە روو .

کارکردن لە گـەل نەتەوایەتی مۆسیقا لە کوردەواری دا کارێکـی تازەیە .. بۆیە ئەلێم تازەیە چونکە بەرهەمە موسیقا و گۆرانیە کۆنەکان هەمووی فۆلکلـــور و میلیـن و دانەرەکانیان دیارنیە ، بـەلام پاش سالانی ١٩٥٠ز بە تەواوی بەملاوە ، دانەری مۆسیقاو گـۆرانی کوردی پەیـدا بوون وە سـال بەسـال پوختەترو جوانتر بەرهەمی خـۆیان پێشکەش کردووە کە مۆرك و گیانی نەتەوایەتی تیا بەدی ئەکرێ بـه جوانتریـن شـێوە ، کەئەمەشی ئەگەرێتەوە بۆ پەیـدا بوونـی نەوەیەکی تێگەشتوو کە هەسـت بە کەلێنی نەتەوەکەیان ئەکەن لـەم لایەنەوە .

**سەرچاوەکـان**


١ ـ تاريخ الحيـاه الموسيقيه / مصطفى كامل الصواف
٢ ـ اساطين الموسيقى العالميه / صميم الشريف
٣ ـ المـوسيقى في العصـــر الرومانيكي / الفرد اينشتين
ترجمه د. احمد حمدي محمود
٤ ـ الموسـيقى الشـعبيه / د. احمد مرسي
٥ ـ تراث الموسيقى العالميـــه / كورت زاكس
٦ ـ تراثنا الموسيقى / الجـزء الاول والثاني / د. محمـود احمد الحفني
٧ ـ تاريخ الموسيقى العالميه / ثيودورم . فيني
ترجمه / دكتوره سمحه الخولي
محمد جمال عبدالرحيم


# بزوتنـ
# لەسـ

نووسینی : دکتۆر قیس هادی احمد

## پێشەکـی : —

گومان لەوەدا نی‌یە کە لە سەدەی سیانزەهـەم و چواردەهـەمدا پەرەسەندنێکی زانستیانەی بـەرز دەستی پێ‌کرد ، ئەو پەرە سەندنەی کـە ئەورووپای رۆژئاوای بـەرەو قۆناغێکی تازە برد کە جیاوازی‌یەکی زۆری لە گەل ئەو قوناغەدا هەیە کە لەسەدە ناوەراستەکانا تێدا ژیابـوو.

.. ئەورووپا وردە وردە بناغەیەکـی تایبەتی لە ژیانی رۆشنبیری‌دا بـۆ خۆی ئامادەکرد کە ئەوەش بە هۆی پێشکەوتنی‌یەوە لە مەیانی کشـتو کالیدا بوو کە وای لێ‌هات ببێتـە خاوەنی بەرهەمێکی یەکجـار زۆر و بۆ ئەوەی ئـەم بەرهەمانە سـەرف بکرێن پێویستی بە بازاری ولاتی‌تـر هەبوو و بەم جۆرە ولاتی خـاوەن بازاری بازرگانی پەیدا بوە وە بـۆ گۆرینی‌شتو مەکی ناوخۆیـی‌و فرۆشتنی ئەو شتە زیادانەی کە لە رۆژر هەلاتەوە نێرراون . ئەبـێ ئەوەش بلێین کە پەیدابوونی شاری گەورە گەورەی پر لە خەلك‌و فراوان بوونی کاتی بێ‌ئیشی‌و فراوان بوونی ئارەزووە جۆر بە جۆرەکان ، ئەمانە بە گشـتی وایان‌کرد خەلکـی ئارەزووی ئەوە بکەن مێشکی خۆیان بە کاربهێنن‌و گەشتێکی زیرەکانـە دەسـت پێ‌بکرێت‌و باشتـرین بەلگەش بۆئەم مەسەلەیە ئەوە بـوو کە گەرانێك بە نێـو بیروورایەکاندا کرا بە مەبەستی زانینـی چەنـد زانستی‌یەکی‌تر ، جگە لەمەش ئـەو گۆرینەش کە تووشی کلێسـە بووو وای‌لێ‌کرد ئەو شێوە تەسکەی کـە لـە سـەدە ناوەراستەکانا هەبوو بگۆرێت‌و ئەو شێوەیە کە قەشەکان لەدێـره بچکۆلەکانا ئەژیـانو زەوی‌یان ئەکێلاو لـە دارستانەکان داریـان کۆئەکردەوەو هیـچ ماوەی‌یەکیان بۆ خوێندن نەبـووو وای لێ‌بێت بکەوێتە ژێر رژێمێکـی پاپایەتی‌یەکی فراوان‌و خاوەن دام‌و دەزگا بتوانێ ماوەیان بۆ خوێنـدن‌و مێشك بەکارهێنان بداتێ‌و ئەمـەش بوو بە هۆی پەیدا بوونی ژمارەیەکی زۆر لەوانەی حەز بە ژیانێکی فیکری بکەن‌و هەر ئەمەش زەمینەیەکی چاك بۆ پەیدابوونی هەندێ رێبازی تـازە لە مەیانی فیکردا پەیداکرد .

بۆیە سەدەی سیانزەهەم پەیـدا بوونی جەماوەرێکی حەز بەزانیاری‌و زانستی‌ی‌دی .

شـەری خاچ‌پەرستەکان یەکـەم گیانبازی ئەورووپا بوو بـۆ فراوان بوونەوەو رێگەی ئـەوەی بـۆ زۆر کەسی خۆش‌کرد بۆ نزیـك بوونەوە لە رۆشنبیری عەرەبی ئیسلامی‌دا ، ئەو رۆشنبیری‌یەی کە بە چەنـد قۆناغێـــك رۆشنبیری ئەورووپای جی‌هێشتبوو .

وەرگێرانی : محمد بدری

# ـەوەی زانستی ـەردەمی راپەریندا

هەروەها داگیرکردنی (قوستەنتینیە) ش لە سالی ١٢٠٤ دا بوو بە هۆیەکی راستەوخۆ بۆ نزیك بوونەوە لە یۆنان . کەسەدەی سانزەهەم گەیشتە نیوە زانیاری سرۆشتی گریکی عەرەبی زۆر بە هێزەوە بناخەی خۆی لە ئۆکسفۆر داکوتاو پاش ماوەیەکی کەم بوە سەرۆکی قوتابخانەکان لە زانیاری سرۆشتی وەرزشی‌دا کە لە گەل زانیاری ئەرستۆی ئارەزووی ناکۆکە .

ئەم هۆیانەو چەند هۆیەکی دیکە بوون بە یارمەتی دانی ئەوروپای رۆژ ئاوا لەو قۆناغەی کە ئەکەوێتە نێوان سەددی سیانزەهەمو کۆتایی سەدەی چواردەهەمدا بۆ ئامادەکردن بۆ پەیدا بوونی شارستانیەتی سەدەی پانزەهەمو شانزدهەم ، ئەو شارستانیەتەی کە بە شارستانیەتی سەردەمی راپەرین ناو دەنرێو هەتا رادەیەکی زۆریشر دوورو فراوان بوو . ئەوەی ئێمە مەبەستمانە لەم باسەدا لایەنی زانیاری‌یەکەیە بۆ ئەم شارستانیەتە کە بە شێوەیەکی فراوان باسی ئەکەین .

## چەند تێبینی‌یەکی گشتی دەربارەی کارتێکردنی زانست لە فەلسفە :

فەلسەفە رێگەیەکی تایبەتی بۆ خۆی نی‌یە بێ ئەوەی رەگەزەکانی تری رۆشنبیری مرۆڤایەتی کاری تێ‌بکەن ، چونکە دوور لە رێبازە رۆشنبیری‌یەکانی تر ناتوانێ بژی ، بەم جۆرە ئەبینین لە سەردەمی راپەرین زانیاری کاری لە فەلسەفە کرد چ لە لایەن مەوزوعیەت لە لێکۆلینەوەدا یان لە گەڕان بۆ سنوور درۆست کردنێك بۆ رێبازێکی چاك کە لێکۆلەوەر بە رێگەیەوە بتوانێ بگاتە ئەنجامی راست.

کارتێکردنی زانست لە فەلسەفەدا لە سەردەمی راپەرین‌دا وەدەرکەوت ، چۆنکە فەلسەفە بەوەوە دەستی پێ‌کرد گرنگی بەو جیهانە بدات کە بە رێگەی زانیاری‌و دەستکەوتەکانی حوکم دراوە . هێرش بردنە سەر شتە کۆنەکان لە سەرەتای ئەم سەردەمەوە دەستی پێ‌کرد بەودی کە تیۆرێکی تازە پەیدا بوو ، ئەو تیۆرە کە لە تاقیکردنەوەو گوماندا خۆی نواندو زۆر بیروورای گەورەی وا کە لاهوتیەکانی سەردەمە ناوەراستەکان دایان نابوو روخاندو باسی پێویستیە زانیاری‌یەکان. لەم سەدەیە رووی بەرەو ئەمان کردو تێبینی رۆلێکی دیاری لە مەیانی گەڕان بە دوی شی‌کردنی دیاردە سرۆشتی‌یەکانا پەیدا کرد .

هەر کە سەدەی پانزەهەم گەیشتە نیوە فەلسەفەی نومینیزم لە ئینگلستان‌و فەرەنسە پەرەی سەندو بەسەر ئەو هەولانە سەرکەوت ماموستاکان ئەیاندا بۆ پەیدا بوونی فەلسەفەیەك لە گەل ئاین‌دا بگونجێ‌و لەسەدەی شانزەهەمیش‌دا هەندێ چەپۆکی بە رووی فەلسەفە سرۆشتی‌یەکەی ئەرستۆی لە زانکۆی پاریس‌داو لە گەل ئەوانە وەستا کە لە رژێمی پاپایەتی یاخی ببوون .

ئەو هێزە نۆیانە کە لەنێو ژیانی کۆمەلایەتی ئەوروپایی بە هۆی پێشکەوتنی زانیاری پەیدا ببوون سنوورو بیروورای زۆریان روخاند ، ئەو بیرورایانەی کە کلیسە لە رۆما بە درێژایی سەدە ناوەراستەکانا هێنابوویانە کایەوەو وازیشیان بەوە نەهێنا کە هەندێ کلیسەی تازە پەیدا بکەن بەلکو چەند تیپێکی ئاینیشان پەیدا کردو لەوانە بروستانتیەت‌بوو .

بەهۆی ئەو رقەبەری‌یە کە لەنێوان ئەم تیپە ئاینی‌یانە پەیدا بوو زانیاری‌و رێبازە عەقلی‌یەکان توانی‌یان بناغەیەك بۆ خۆیان درۆست بکەن . جگە لەمەش مەسەلەی جیابوونی کلیسە نیشتمانی‌یەکان لە کلیسەی رۆما ئەمە بۆخۆی شۆرشێك بووو بەشداری لەوەکرد کە نموونەیەکی بەرز بۆ جیهانە مەسیحیەیەك گرتوەکە

بگۆڕێت و بۆ خزمەتی خواو مرۆڤ هەوڵ بدات و نموونەیەکی بەرزتر بهێنیتە کایەوە ، ئەو نموونەیە کە پێ بکرێ لە درۆست بوونی چەند دەوڵەتێکی سەربەخۆ خۆی بنوێنێ و تەنیا بەرامبەر بەخۆی مەسئول بێ .

راپەرینەکە لە ئیتالیادا وەك گەڕانێك بە دوی رۆشنبیری یە کۆنەکە دەستی پێ کرد ، شۆرش کردن دژ بەو شتە نۆی یانەی کە لەسەردەمە ناوەراستەکەدا پەیدا ببوون ئەددب بێ یان زانیاری یان ئاین و نەك تەنیا ئەمانە بەڵکو رێبازە رامیاریەکان و ئابووریەکانی ژیانیشی گرتەوە . ئەم راپەرینە بەرەو فەرەنسەو ئینگلستان و ئەڵمانیاو هۆڵەندا رۆیی و ئەوەی خێرایی بەم گواستنەوە یەش دا پەیدا بوونی چاپخانە لە ناوەراستی سەددی پانزەهەمدا بوو .

رۆشنبیری ئەو سەردەمە لە مەیانی بیرو رەویشتدا بە بت پەرستی ناسراوبوو .

کۆمەڵێکی زۆر لە رۆژئاوای یەکان وێنەی مرۆڤی سرۆشتی یان لەم رۆشنبیری یە ئەبینی ، ئەو مرۆڤەی کە بۆ خۆی ئەتوانێ بەو پەری ئازایەتی یەوە مرۆڤایەتی خۆی جێ بەجێ بکات و لایان وابوو کە لێکۆڵینەوەکانی پیاوە کۆنەکان پێیان ئەکرێ مرۆڤی راستەقینە دروست بکەن ، بۆیە ئەم رێبازە بە رێبازی مرۆڤایەتی ناونراو وێژە کۆنە کانیش مرۆڤایەتی یەکانیان پێ ئەوترا . رەنگە باشترین نموونەش بۆ رۆڵی زانیاری لە سەردەمی راپەرینەکەدا هونەرمەندی گەورە (لیۆناردو داڤینشی ١٤٥٢ ـ ١٥١٩) بێ کە کەڵکێکی زۆری لە مەسەلەی زانیاری یە میکانیکیەکەو تاقیکردنەودی وەرگرت .

دافینشی پیاوێکی لێهاتووو خاوەن هەست ووتوانی پێش پەیدا بوونی تیۆرە زانیاری یەکان و شتە دۆزراوەکان هەستیان پێ بکات . دافینشی پێ کرا هەست بە مەسەلەی سووڕانی خوێن بکات ، ئەو شتە کە (ولیەم هارڤی) لە ساڵی ١٦١٥ داتوانی بیدۆزێتەوە ، هەر وەها لە مەیانی زانیاری بینین دا توانی هەست بە تیۆری شەپۆلەکانی رووناکی بکات . جگە لە مانەش توانی بیر لە فرۆکەو ئۆتۆمبیل و مەکینە گەورەکان بکاتەوەو تێبینی یەکانی هەتا ئیستاکە لە مەیانی فەسلەجەدا رەچاو ئەکرێن و بەچاوێکی پڕ رێزەوە تەماشا ئەکرێن .

ئەو شۆرشانەی کە لە زانیاری فەسلەجەو فیزیولۆجیادا هاتنە کایەوە کارێکی یەکجار زۆریان لە تیۆرە کلاسیەکانداکرد ، چۆنکە وایان کرد خەڵقی گۆمانیان لێ بکات و مێشکی ئامادەو وریا کرد بۆ گەڕان بە دوی لێکۆڵینەودی زانیارانەو بروایان نەمێنێ بەو زانا گەورانەی کە چەندەها سەدە بوو لەمەیانی فەلسەفەدا لە ریزی پێشەوە بوون .

## زانیاری سەردەمی راپەڕین ..

زانیاری سەردەمی راپەرینەکە وردە وردە خەریکی پەرەسەندن بووو لە کوتایی سەدە ناوەراستەکانا ئەوروپای رۆژ ئاوای دو قوتابخانەی زانیاری یی بینی یەکەمیان قوتابخانەی (ئۆکام) بووو بنکەکانی لە نێوان ئوکسفۆردو پاریس دابەش کرابوون و دووەمیش قوتابخانەی (ابن رشد)ی ئەرستۆی کە پێوەندی یەکی بە تینی بە قوتابخانەی پزیشکی ئیتالیاوە وەبوو . ئیش کردنی قوتابخانەی یەکەم بۆ سەددی چواردەهەم ئەگەرێتەوەو قوتابخانەی دووەمیش بۆ سەدەی پانزەهەم و شانزەهەم ئەگەرێتەوە .. یەکەمیان دەربارەی زانیاری جم وجۆڵ و بەردەوامی ئەدواو دووەمیش دەربارەی زانیای نەژاد دواو بایەخێکی زۆریشی بە زانیاری جەوجۆڵ دابوو . هەر دو قوتابخانەکان بە پاڵپشتی رەخنە گرتنیان لە فەلسەفەی ئەرستۆی سرۆشتی دا پێشکەوتن و قوتابخانەی (بادو)ی ئیتالیا هەر لە ساڵی (١٤٠٠) دا بە هەموو بەرهەمەکانی قوتابخانەی (ئوکام)ی ئەزانی و کردبویانە وانە . زاناکانی (بادو) هەر لە (پۆڵس بندقی) یەوە (١٤٢٩) هەتا «کریمونینین» ـ ١٦٣١ ـ شارەزای ئەو جیاوازی یە بوون کە لە نێوان زانیای سرۆشتی ئەرستۆی کۆن و زانیاری سرۆشتی وەرزشی هەیە ، زانیاری سرۆشتی وەرزشی کە بە هۆی ـ گالیلۆ ـ وە گەیشتە پلەیەکی بەرز .

•

لە راستی دا لێکۆلەوەر هەرچەند درێژە بە خوێندنی لە مەیانی مێژووی فیکر بدا لە سەدە ناوەراستەکان و سەردەمی راپەرینەکە ، بۆی روون دەبێتەوە کە زۆربەی ئەو پەرەسەندنە کە لە مەیانی زانیاری دا رووی داوە دورکەوتنێکی زۆر کەمە لە زانیاری یە ئەرستۆیەکەو هەر لە باوەشی ئەم زانیاری یەدا پەرەسەندوەو ئەمەش بە هۆی بروا پێ کردنە بە بیرە رەخنەیەکەی رێبازی ئەرستۆ بوو بێ ئەوەی گوێ بدرێتە ئەو سەر چاوانەی کە ئەم شێوە رەخنەیەیان یارمەتی داوە .

## بناغەی تاقیکردنەوەکانی زانیاری

رەنگە هەتا رادەیەك ئەوە راست بێت کە دوور نی‌یە زانیاری بەهۆی تێبینیو تاقیکردنەوەوە پێشکەوێتو بەلگەشمان بۆ ئەمە ئەو پەرەسەندنەیە کە زانیاری لە سەردەمی راپەرینەکەدا بینیو ئەمەش دەبێتە نموونەیەکی زیندوو بۆ سەلماندنی ئەم بیرورایە ! ئەو پەرەسەندنە کە رەنگ بوو زیاترٚ پێشکەوێتو بەرهەمی باشتر بەدەست بدات گەر زانیاری سەردەمی راپەرینەکە مەسەلەی تاقیردنەوە لە مەیانی لێکۆلینەوەدا بە بناغە بکردباو هەرچەندە ئەو زانیاری‌یە گرنگی‌یەکی بە تاقیکردنەوەی دابوو بەلام ئەو گرنگی‌یە پێویستە نەبوو بتۆانێ والە تاقیکردنەوە بکات رۆلێکی کاریگەر ببینێ . تێبینیو تاقیکردنەوە رۆلێکی ئەوتۆی لە مەیانی لێکۆلینەوەی زانیاری‌یانەدا نەبوو بەتایبەتی لە زانیاری فەلەكو سروشتدا کە رێگەیەکی وەرزشی‌یان بۆ چارە سەرکردن گرتبوو .

( کۆپەرنیکوس ١٤٧٣ ــ ١٥٤٣ ) نەیتوانی تەنیا بەهۆی تەماشاکردنی ئەستێرەکانەوە بگاتە دۆزینەوەکەی خۆی بەلکو بەهۆی خۆیندنی (شیشرۆن)ەوە کە ئیشارەتی بەوە دابوو کە (هێکتاس) یش وتبوو ئەرز رۆژانە بە دەوری خۆی‌دا ئەسورێتەوەو هەروەها لە ــ ئەرستار خوس ــ یش بیرواری سورانی ئەرز بە دەوری خۆیو سورانی بە دەوری هەتاودا وەرگرت. کوبەر نیکۆس هەمیشە خەریکی خوێندنی ئەم نووسینانەبووو گوێی بە هیچ جۆرە تێبینی‌یەکی‌تر نەدا لە کاتی دارشتنە تازەکەی . ئەو وردە گرنگی‌یەش کە (کپلەر) بە تێبینی دابوو بە تەئسیری ماموستاکەی ــ تیخۆ براهی ١٥٤٦ ــ ١٦٠١ ــ بوو ــ ئەو زانایە کە خاوەنی یەکەم روانگەی فەلەکی بووەو توانیویەتی بە درێژایی ئەو چەند سالە کۆمەلێکی تێبینی کۆبکاتەوەو هەر چەندە ئەو گرنگی‌یەی بە تێبینی نەدابوو بەلام توانی هەندێ ئەنجامی باشی دەسکەوێتو ئەمانە ببن بە هۆی سەرەتایەکی چاك بۆ پەرە سەندنێکی نوێ لە زانیاری (فەلەك)دا .

## تاقیکردنەوەی ئەزموونی‌ی :

ئەوەی روونو ئاشکرایە کە تێبینی ئاسایی نابێتە هۆی ئەوەی لێکۆلەوەر بەوە بگەیێنێ بروا بە دروستی ئەو ئەنجامانە بکات کە لە لێکۆلینەوە زانیاری‌یەکەدا وەدەستی ئەکەوێ ، بۆیە پێویست بە تاقیکردنەوەی زانیاری‌یانە هەیە کە زانا بە رێگەیەوە دلنیا لە ئەنجامە زانیاری‌یەکانی‌دا ئەکات ، بەلام ئەوەی گومانی تێدا نی‌یە ئەوەیە کە زاناکانی سەردەمی راپەرینەکە هیچ گرنگی‌یەکیان بە تاقیکردنەوە نەئەدا .

(کبلەر ١٥٧١ ــ ١٦٣٠) رێبازە (فیتۆ گۆرسی) یە سووفیەکەی ئەنواند چونکە هەمیشە هەولی ئەوە ئەدا ئەو پێوەند یە وەرزشی‌یە دیارە وردە وردە بدۆزێتەوە کە بۆ خۆی سرووشی گیانی خواوەندەو جیهانیش لە لای ئەو سیانە پیرۆزەکەیە ــ الثالوث المقدس ــ و هەتاو باوکەو زەویش کورەو پێوەندی‌یە ئەندازیاری‌یەکەی نێوان یانو باقی ئەستێرەکانی تر گیانە پیرۆزەکەیە ــ الروح القدس ــ . رەنگە هەلویستی گالیلۆ ١٥٦٤ ــ ١٦٤٢ لە زانیاری سروشتی‌دا گەرانێك بۆ هەلویستەکەی یۆنان بێو بە تایبەتی لە مەسەلەی گرنگی دانە بە وەرزش ، چۆنکە هەردوکیان هەولی ئەوەیان ئەدا لە شتەوردەکانەوە دەست پێ بکەنو پاشان بۆیان بگەرێنەوە بۆ بینینی راستو درۆیی ئەنجامەکانی بەلکو بە پێچەوانەوە ئەو پرسیارانەی کرد کە لە پێشەوە ئامادەیان کردبوو ئنجا هەول ئەدا ولامیان بداتەوە بێ ئەوەی پەنا بەرێتە بەر تاقیکردنەوە بۆ دەرخستنی راستەقینەی ولامەکانی . بەلام ئێمە چۆن چاوەروانی تاقیکردنەوە لە زاناکانی سەردەمی راپەرینەکە بکەینو ئەم شتەش (گالیلو) بۆ خۆی ئەوە ئاشکرا ئەکا کاتێ دەلێ من هیچ پەنام بۆ تاقیکردنەوە نەبردوەو گەر هەتا رادەیەك ئەمەم کردبێ تەنیا بۆ بەرپەرچدانی دوژمنەکانم بووەو بە درێژایی ژیانی لەسەر ئەو هەلەیە سوورِ بووە کە ئەوە ئەگەیێنێ کە هێزی راکێشان ــ الجاذبیە ــ لە یەك چرکەدا ئەکاتە پانزە پێ .

## زانیاری فەلەك

گەر ئەوە راست بێت کە لێکۆلەوەر بۆ جێ بەجێ کردنی باسەکەی پێویستە پەنا بباتە بەر تاقیکردنەوە بۆ ئەوەی بزانێ چی روو ئەدا ئەبێ ئەوەش راستبێ کە چەند پێشنیارێکی زانیاری‌یانەش ئامادە بکاو هەولی ئەوە بدات بکاتە راستو درۆیی‌یان ، بۆیە پێویستە پرسیارێکی تایبەتی بکا ، پرسیارێك رێگەی ئەوەی پێبدا

پێشنیارێك یان دو پێشنیار ئامادە کات و بەرێگەی تاقیکردنەوەدا بتوانێ لە راستی یەکێکیان دلنیابێ ، بەلام ئەوەی ئێمە لامان روون و ئاشکرایە ئەوەیە کە زاناکانی سەردەمی راپەرینەکە ئەم جۆرە رێبازەیان بەکار نەهێنابوو ، زاناکانی سەردەمی راپەرینەکە هیچ روانینێکی دیاریان بۆ چۆنیەتی پێشنیار لە تیۆرەکانیان نەبوو هەر چەندیش کە پێشنیاری زانیاری ـ یانەشیان بەکار ئەهێنا بەلام بە شێوەیەکی نارێك و ناوردو لە مەیانی زانیاری فەلەکدا نموونەی زۆمان بۆ ئەو بەکارهێنانە هەیە .

راستە (کۆپەرنیکۆس) یەکەم کەس بوو هەوڵیدا ئەوە بسەلمێنێ کە جوڵانەوەی هەتاو لە رۆژهەلاتەوە بۆ رۆژ ئاوا شتێکی ئاشکراو لە راستیدا بەم وێنەیە نییەو ئەمەش دژ بەو بیروڕایە ئەوەستا کە بە درێژایی سەدەی چواردەهەمدا بڕوای پێ کرابوو . چونکە پیاوە فیزیاوییەکان خەریکی ئەوە بوون لەو مەسەلەیە بگەنە ئەنجام کە دەڵێ زەوی هەموو رۆژێك بە بەردەوامی بە دەوری خۆیدا ئەسوورێتەوەو کۆبەر نیکۆس ئەیویست ئەوە بسەلمێنێ کە ئەرز بەدەوری خۆیدا ئەسوورێتەوەو بە دەوری رۆژیش ئەسوورێتەوە کە هەتاو راوەستاوەو بەم جۆرە کۆبەر نیکۆس ئەوەی گۆڕی کە ئەرز مەرکەز بێت . ئەمە هەمووی راستە بەلام ئەوەی جێ گۆمانو سەرسوورمانە لە تیۆرەکەی ئەوەیە ئەم تیۆرە هیچ پێشنیارێکی پێشەکیی نەبووو دووریش لە مەیانی تاقیکردنەوەدا بوو .

ئەوەی بەلگەبێ لێرەدا ئەوەیە ئەو کەسەی کە تیۆرەکەی کۆبەر نیکۆسی بلاو کردەوە لە پێشەکییەکەیدا ئەلێ : تیۆرەکەی کۆبەر نیکۆس کەشفێکی زانیارییانە نییەو تەنیا پێشنیارێکی خەیالییەو رێبازێکی زانیارییانە نییەو زانای فەلەکیش مافی ئەوەی هەیە تووشی هەلەو لادانی خەیالی بێ .

## ماتماتیك :

هەموو زانایەك ئەتوانێ هەندێ ئەنجامی راست وە دەست بهێنێ گەر هات و ماتماتیکی وەك شتێکی سەرەکی لە لێکۆلینەوەکەیدا بەکار هێنا بەلام تێبینییش نابێ پشتگوێ بخرێت ، چونکە ئەوزانایە مەسەلەی سەلماندنی پێوەندی لە نێوان ئەنجامە جۆر بە جۆرەکانی لێکۆلینەوەیدا بۆ ماتماتیك جێ ئەهێلێ و ئەمیش ئامادەیی خۆی پیشان ئەدا بۆ بە کار هێنانی ئەم پێوەندیانە بۆ رێگە پاك کردن بۆ دۆزینەوەی شتی تازە کە بەهۆی تێبینییەوە پەیدا دەبێ و بە بەردەوامی ئامادەیە بۆ ئەوەی واز لەوئەنجامە ماتماتیکیانە بهێنێ گەر هات و بە تێبینییە داهاتوەکە ساغ نەکران . بەلام زاناکانی سەردەمی راپەرینەکە ئەم رێبازەیان نەگرتبوو چونکە سروشت لای ئەوانە تەنیا شتێکی ماتماتیکیی گەورە بوو شیکردنەوەی ماتماتیکیش هەوڵ و تەقەلایەك بوو بۆ دۆزینەوەی یاساکانی . دوور نییە زاناکانی سەردەمی راپەرینەکە بەگشتی لە گەل لیوناردو دافنشی بن کە دەلێ لە کتێبەکەیدا « هەندێ پارچەی ئەدەبیی و فەلسەفی » ـ یاساکانی سرۆشت ئاسان و رێك و پێکن ، چونکە هەر یەکێك لە کردەوەکانیدا بە رێگەیەکی کورتەوە جێ بەجێ ئەکرێت و ئەم پێویستیە بێ کۆتاییە لە بناغەدا شتێکی ماتماتیکییەو بۆ یەش ماتماتیك بە تەنیا بۆ گەیشتن پێی تەنیا رێگە بووو بە هۆی ئەم دروستبوونەماتماتیکیەی جیهان ئەتوانین زانستییە ماتماتیکیەکەمان بخەینە تاقیکردنەوەوەو ئەتوانین بە هۆی ئەم رژێمەوە لە یەك تاقیکردنەوەدا یاسا ماتماتیکیەکە بەدی بکەین .) .. بەلام ئەم روانینە رۆلێکی ئەوتۆ بە تاقیکردنەوە نادا ، ئەو رۆلەی کە پێویستە لە لێکۆلینەوەی زانیاریدا هەبێ و ئەوەی راستیش بێ زاناکانی سەردەمی راپەرینەکە تاقیکردنەوەیان تەنیا وەك شتێك دژ بە دوژمنەکانیان بەکار ئەهێنا .

## روانینی میکانیکی دەربارەی جیهان

وتە بە ناوبانگەکەی گالیلۆ (جیهانی مەوزوعی جیهانی ماتماتیکە )و هەروەها تەئکیدە بەردەوامەکەی لەسەر ئەوەی کە جیهان کتێبێکەو پێمان ناکرێ بیخوێنین گەر ئەو زمانە نەزانین کە پێنووسراوەو ئەو پیتانەش تێنەگەین کە کتێبەکەیان ئامادە کردوە . چونکە ئەو زمانەی کە زاناکە کتێبەکەی پێ نووسیوە زمانی ماتماتیکە وپیتەکانیش (سێ گۆشەو بازنەو هەندێ رەگەزی ئەندازیاریی تر)و ئەمەش وەك رێگەیەك بوو وای لە گالیلۆی کرد بڕوا بە روانینە میکانیکیە دەربارەی جیهان بکات و بەم جۆرە گالیلۆ بڕوای بە ئوتۆمەکان و بەو گۆڕانەی کە لە جیهانا لەسەر بناغەی تیۆرە

ئۆتومی‌یەکە ئەکرێ هێناو لەسەر ئەوە سوور بوو کە شێوەی ماددە لە ڕەنگو گەرمایی وەك شتێکی مەوزوعی لەو شتەدا هەیە کە هەستی پێ ئەکرێو ماددە وەك ئۆتوم هەیەو هەمیشە لە جموجۆڵێکی بەردەوامەو ڕژێمێکی میکانیکیو ماتماتیکی دەسەڵاتی بەسەریەوە هەیە .

ئەم ڕوانینە میکانیکیەکە لەسەر بناغەی تیۆرە ئۆتۆمی‌یەکە دروست کراوە زۆر کەس لە زاناکان بروایان پێ هەبوو لەو زانایانە ( ڕۆبرت بۆیل ١٦٢٧ ـ ١٦٩١ ) کە بڕوای بەوە بوو ماددە لە ئۆتوم پێك هاتووەو ئۆتومەکان لە یەك جیبا ناکرێنەوەو بچووکتر نابنو ئەم ئۆتومانە کە کۆدەبنەوە وردە شت دروستدەکەن . (نیوتن) پشی لە ڕوانینە میکانیکی‌یەکەی گەیشتە ئەو پەڕیو هەوڵی ئەوەیدا ئەوە بسەلمێنێ کە هێز کارلەسەر لەشەکانئەکا ، چونکە ئێمە بەهۆی ماتماتیکەوە هەست بە جموجۆڵی ئەم لەشانە ئەکەینو ووتی ئەم ئۆتومانە بۆ خۆیان خاوەنی مەرکەزی ئەم هێزانەن . هەرچەندە خۆی خەریکی ئەوە بوو لە جموجۆڵی لەشە ڕەقەکان بکۆڵێتەوە بەڵام مەبەستی سەلماندنی ئەوە بوو کە جموجۆڵی لەشەکان بە گشتی ئەبێ بە هۆی بیروڕایە ماتماتیکی‌یەکان لێ بکۆلرێتەوەو (نیوتن)وتی پسپۆرە سروشتی‌یە کۆنەکان پێیان نەکراوە یاساکانی سروشت بدۆزنەوە چونکە ئەم ڕاستی‌یەیان نەزانیوە .

بەم جۆرە (نیوتن) بینی تەنیا یەك کاری ڕەسمی‌ی هەیە ئەوە بریتی‌یە کە دارشتنێکی ماتماتیکی بۆ ئەو هێزانە پێشکەش بکات کە دەسەڵاتیان بەسەر سروشتەوە هەیە . کە هەوڵیشی ئەدا بۆ سەلماندنی ئەوەی کە هێزی ڕاکێشان هۆیە سەرەکی‌یەکەیە بۆ کەوتنی سێوەکە لە دارەکەدا بۆ سەر ئەرزو هەر هەمان هۆی‌شە بۆ سووڕانی ئەستێرە گەڕۆکەکان بە شێوەیەکی ئەلیلیجی بە دەوری هەتاودا ، کە هەوڵی بۆ سەلماندنی ئەمە ئەدا مەبەستی ئەوەبوو بڵێ جموجۆڵی ئەستێرەکان بەم شێوەیەو کەوتنی سێوەکە هەردوکیان پێکەوە بە یەك یاسای ماتماتیکی‌یەوە بەستراون .

ئەو بیروڕایە گشتی‌یانە کە (نیوتن) دایان ڕشتەوە بە درێژایی دوو سەدە ڕۆڵێکی کاریگەریان بینیو ئەوەی شایانی باسیشە کە فیزیا بە درێژایی ئەو دوو سەدەیە بەناوی نیوتن ناسرابووو بە فیزیای (نیوتن) ناو ئەنرا .

## ڕەخنەو هەڵسەنگاندن :

زۆر زەحمەتە کەبڵێ زانیاری سروشتی لە سەردەمی ڕاپەڕینەکەدا هیچ پێوەندی‌یەکی بە زانیاری‌یە کۆنەکەوە نەبوو . لە ڕاستی‌دا ئەمە پەرەسەندنێکی زانیاری‌یانەبوو و زیاتر لەوەی‌تر ڕەخنەی بەرەو ڕووکرا و لەو سەردەمەدا ، واتە لە کۆتایی سەدە ناوەڕاستەکاندا ناسرابوو . ئەو لێکۆڵەوەردی بەوردی بڕوانێتە ڕێبازە مرۆڤایەتیەکەو بزوتنەوەی چاك کردنی ئاینی‌یەکە کە دو ڕێبازە فیکریە سەرەکی‌یەکەی سەردەمی ڕاپەڕینەکە بوون بۆی ڕوون ئەبێتەوە کە هەردوکیان پێکەوە ئەگەڕێنەوە بۆ ئەو هۆیانەی کە ڕاپەڕینەکەیان بەگشتی هێنایە کایەوەو لەپێشی ـ پێشەوە ئەو پەرەسەندنە ئابوری‌یە گەورەیە بوو کە ئەوروپا دروستی ـ کردو بوو بە هۆی پەیدا بوونی چینە ناوەڕاستەکە .

ئێمە کە لەم دو بزوتنەوەیەدا ورد دەبینەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە هۆیەکانی ، بەڵام بە شێوەیەکی جیا جیا ، بۆ هەمان پاشماوەی قوتابخانەکان دەگەڕێتەوە ، چونکە هەردوکیان وەك یەكو بەشێوەیەکی دیار بەرەو ڕێبازی پاككردنەوەو چاككردن لەمەسیحیەتدا کۆتایی‌یان پێ‌هات ئەو کۆتایی‌یەی کە لەپاشان بە شێوەیەکی فیکری بیروڕایەکانی سەدە ناوەڕاستەکانا سەلماند ، ڕێبازە مرۆڤایەتیەکە هەرچەندە کە عەقڵی مرۆڤی هەتا ڕادەیەك ئازاد کردەوە بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ئەمە گەڕانەوەیەك بوو بۆ سەدە ناوەڕاستەکان چونکە هیچ گرنگی‌یەکی بە زانیاری سروشت نەداو لێ‌دوورکەوتەوە ، ئەو زانیاری‌یە کە لە سەدەی سیانزە ـ هەمدا دەستی پێ‌کرد و بە سووربوونی لەسەر ئەدەبە کلاسیەکاندا ڕێگەی لە بڵاو بوونەوەی ڕۆشنبیری گرت و ئەیهێشت پەرەبستێنێ .

بۆ ئەوەی ئەوە بسەلمێنین کە ئینسانی‌یەکان ڕێبازی زانیاری ـ یانەیان نەبوو ئەتوانین دوشت بکەین بە بەڵگە کە ئینسانی‌یەکان لە کاتی پەیدا بوونیاندا هیچ جۆرە گرنگی‌یەکیان پێ نەدا دو ڕووداوە ـ کەش :

داهێنانی چاپەمەنیو دۆزینەوەی جیوگرافیەکان بوو . ئینسانی‌یەکانی سەردەمی ڕاپەڕینەکە هیچ دڵیان بە پەیدا بوونی چاپەمەنی نەبوو بەڵکو بەپێچەوانەوە دژی وەستانو بۆ نموونەش :

( فسزیا نۆدا بستیشی ) کـــە یەکێك لە خاوەنە بیروراپە خانــە ــ دانەکەی سەدەی پانزەهــــــەمدا بووە ، و هەر چەندە لە ســـــالی ١٤٩٨ دا مردوە ، واتە لەو کاتەی کە چاپەمەنی لە پلەیەکی بەرزدا بوە، ئەم زەلامە هەتا رۆژی مردنی رقی لە چاپەمەنی بوو ... وەکو ئەلێـن فسزبیانۆ دۆستێکی زۆر نزیکــی ئــەبێ بەناوی دۆق (ئوربینو) زۆر شەرمی لەوە ئەکـرد بیێتە خاوەنـی کتێبێکی چاپکراو ، و هــەلویستی ئینسانیە کان لە چاپەمەنـــیدا نەگۆڕا هەتا ئەو رۆژەی کە بۆیـان ئاشکرابوەوە ئەمــــە شتێکــــی زەحمەتەو هەلویستەکەیان عەیبو ناشرینە. و سەبارەت بە دۆزینـەوە جیوگرافیەکانیش ئینسانییەکـان نەك تەنیا دژی وەستان بەلکــو وایان لەخۆیان کرد کـــە قـــەد بەرگوێیان نەکەوتووە .

مەسەلەی دۆزینەوەی شـوێنی تازە هەمیشە لەبەردەوامی دابــوو سنوری جیهانە رۆژ ئاوایـییەکە. فەوتاو گەرۆکەکانی بــــە دەوری ئەرزدا دەستیان بە گەڕان کرد، ئایا ئەمانە بەگشتی شایانی ئەوە نەبوون شاعیرە ئینسانییەکان شانازی پێوە بکەن ؟ هەتا ئەو ئەدەبی کە بۆ ئـەم کردەوە مەزنانە تەرخان کـرابوون شتێکی بێماناو بێ کەلکبوون و ئەو کردەوە گەورانە نەیانتوانـــــــی بەرهەمێکی ئەدەبی بەرز بهێننــە ــ کایەوەو بۆیە ئەبوایە جیهان بـــۆ ماوەیە کی دوورو درێژ چاوەروانی ئەوە بێ ئەم کردەوە بێنە کایەوە بەلام ئەمە لەو کاتە رووی دا کە راپەرینەکە تێپەڕبوو سەردەمە ئالتونییەکەی گەشتـــە جیوگرافییەکە کۆتایـــی پێهاتبوو .

بزوتنەوەی زیندوکردنی ئەدەبـە ئینسانییەکە کۆسپێکی گــەوردی لە رێگەی پەرەسەندنی زانیاری بــە سروشتییەکەی داناوبوو چونکـــــە هەولو تەقەلای زاناکانی بەگشـتی لە پەندێکی دوور لەزانیـــــــاری کۆکردبوەوە کە رۆمانی یەکـــــان باوەڕیان پێ هەبووو گشت گرنگی ــ یەکیان بۆ مەسەلەی شارستانیەتو زەوشت تەرخان کردوو .

ئەمە لەلایەك و لەلایەکی تــرەوە بزوتنەوەی چاك کردنی ئایینـــــی هەرچی هێزو توانای هەبوو بـــۆ چارەسەرکردنـــی مەسەلــــەو گیروگرفتە لاهوتیەکان تەرخــان کردبو کە ئەمەش بوو بە کۆسپێکی گەورە لــەرێی پێشکەوتنو پــەرە ــ سەندنی زانیاریدا .. ئەگەر چــی بزوتنەوەی چـــاك کردنی ئایینی یارمەتی زانیاری بــەرەو پێشکــە ــ وتندا چونکە هەمیشە هەولـــی ئەوە ئــەدا لە تونــدی دۆگماتیزمو رەگەز پەرستەئایینی یەکە کــــەم بکاتەوە بەلام لەهەمان کاتــــــدا بزوتنەوەیەکی ئایینی بووو هەولـی ئەوەی ئەدا وا لەرێبازە مەسیحیەکە بکـــا توانای ئەوەی هــــەبێ دژ بەپێشــــکەوتنە زانیـــــارییەکە بوەستێتو هەروەهـــا هەولـــی ئەوەش ئــەدا بــە دووی نیمچـــە چارە سەرکردندا بگەرێ .

بۆیە زانیاری نوێ بەو جیهانــــە فیکـــرییـــەی کەئێستاکـــــە تێدایەتی بە هیچ شێوەیەك قەرزاری رێبازە مرۆڤایەتییەکەو چاككردنــە ئایینییەکەنییە چونکە قەرزاری ئــەو شۆرشە مەزنەیە کە توانی خەلقـی لەسەدە ناوەڕاستەکانا بـــــــەرەو جیهانی تازە ببات و ئەوەش بە هۆی پەرەسەندنی زانیاری تاقیکردنەوەدا بووو بەم پەرەسەندە کە لەسەدەی حەڤدەهەمو هەژدەهەمدا روویدا.

لێرەدا ئەوەمان بۆ روون‌دەبێتەوە کە سەردەمی راپەرینەکە راپەرینێکی تەواو نەبوو لە رێبازی زانیـاریدا بەلکو سەردەمی ساواکردنو نیمچە چارەسەر کردن بووو هەر چەندە کە دیاردە سەرەکییەکەی ســەردەمی راپەرینەکە پەرەسەندنی زانیـاریو زبوونە وەی دەسەلاتی کلیسەبوو، بەلام ئێمە ئەوەی تێـدا ئەبینین کـە لە ناو رژێمە کۆنەکەدا هێزی تازە تازە پەیدا بوو ، لەگەل ئەمەشـدا ئەو هەولانە هەبوون کە هەمیشــە توانای خۆیان بەکار ئەهێنا لــە ــ پێناوی جۆرە رێکەوتنێك لە نێوان رێبازە تازەکانو بڕواکـردن بــە رژێمە لاساییەکان ، بۆیە ئــەم هێزە تازانە پێیان نەکرا شۆرشێکی بنەڕەتی لە رێبـازی بیرکردنـــی مرۆڤدا بکەن چونکـە ئەوەی رووی دا پاش ئەو بزوتنەوەیە زانیارییانە بوو کە لە سەدەی حەڤدەهـــەمو هەژدەهەمدا روویدا .

**سەرچاوەکان**

١ ــ راندال (جون هرمان) تكوين العقل الجديث (الجزء الاول) ترجمه د. جورج طعمة . مراجعه الاستاذ برهان الدين الدجانى . تقديـــم د. محمد حســين هيكل . (دار الثقافه . بيروت ) . بالاشتراك مع مؤسسه فرانكلين للطباعه والنشـر . ١٩٥٨ .

٢ ــ رايشتباخ (هانز) . نشــأة الفلسفه العلميه . ترجمه د. فـؤاد زكريا . دار الكاتب العربى ١٩٦٧ .

٣ ــ سارتون (جورج) واخرون. حضاره عصر النهضه . ترجمـــه د. عبدالرحمن زكى ، مؤسســه فرانكلين للطباعه والنشر . القاهره. نيويورك . ١٩٦١ .

٤ ــ كرم (يوسف) تاريخ‌الفلسفه الحديثه . دار المعارف بمصـــر . ١٩٦٢ .




**١ ـ هەڵوێستی دەوڵەت :**

دەزگاکانی رادیۆو تەلەفزیۆن ، بە بەڕێوەبەریەتی ڕاگەیاندنی جیاکەرەوە دەدرێنە قەڵەم لە جوارچێوەی رامیاری دەوڵەتدا . لێرەدا دەبێ سیستەمی ڕاگەیاندنی دەوڵەت لێ‌ی بکۆڵرێتەوە ، کە دەمانەوێ نیشانەکانی دەزگاکانی رادیۆو تەلەفزیۆن کە کاری تێدا دەکەن بزانین .

گومانی تێدا نیە کە سیستەمی ڕاگەیاندنی هەر دەوڵەتێك لە دەوڵەتانی جیهان لە ڕێگەی ئەوباساو سیستەمانەی کە کاروباری دەزگاکانی ڕادیۆگەری ڕێكدەخەن دەستنیشان دەکرێ .

لە ئەنجامی زۆربوونی ئێستگەی رادیۆو تێکەڵبوونی شەپۆلی هەندێ لەو ئێستگانە لەگەڵ هەندێکی تر پێویستی ڕێکخستنی کاروباری دەسکاکانی بڵاوکردنەوە سەری‌هەڵدا .

بەڵام دەوڵەتان تەنیا بە ڕێکخستنی کاروباری ئێستگەکانی بڵاوکردنەوە لەڕووی بەیەکداچوونی شەپۆلەکانەوە نەوەستان ، بەڵکو دەسەڵاتی خۆیان درێژکردەوە بۆ ئەوەی جموجووڵی ئەو دەزگایانە بگرێتەوە ، بەتایبەتی کە دیتیان هۆیەکی ڕاگەیاندنی زیندەگی‌و کارتێکەرە .

ئەگەر هەموو دەوڵەتان لە جیهان هەوڵی ئەوە دەدەن کە بەشێوەیەك یا هی تر دەسەڵات بسەپێنن بەسەر دەزگاکانی بڵاوکردنەوە ، لە ڕێگەی بەڕێوەبردنیان یاخود لە ڕێگەی پارە پێدان یا دانی ڕێگەپێدانی دامەزراندنی ئەو دەزگایانە ، ئەوە هەندێ دەوڵەت ـ دیسانەوە ـ تەقەللای ئەوە دەدەن کە ئەم هۆیە ڕاگەیاندنە بکەن بە ئامرازێ بۆ بەپەرەوکردنی دادپەروەری کۆمەڵایەتی‌و رامیاری لە یەك کاتدا ، کە مەودای هەموو کۆمەڵانی رامیاری دەدات کە ئەم هۆیە لە پڕۆپاگندەی هەڵبژاردن یاخود نیشاندانی بۆچوونی خۆیان لە کاروباری وولاتدا بەکاربێنن ، هەروەها ڕێگەی تاقمە ڕۆشنبیری‌و کۆمەڵایەتی‌یەکان دەدات کە بیروڕای خۆیان دوور لە چاودێری لەمەوبەر دەربڕن . بەڵام دەبێ ئەو بیروڕایانە بڕژێنە ئاوەڕووی گشتی ئایدیۆلۆژیەتی دەوڵەت لەگەڵ دووپاتکردنەوەی پێویستی دوورکەوتنەوەی دەوڵەت لە توندوتیژی بەکارهێنانی ئەم مافە . لەبەر ئەوە دەس‌تێوەردانی دەوڵەت بە دوو شێوە دێتەدی :

یەکەم ـ هەڵوێستی نابەجێی دەوڵەت بەرامبەر دەزگاکانی بڵاوکردنەوە .

لەم بارەوە ، دەوڵەت بە دەرکردن‌و نوێ‌کردنەوەی ڕێگەی پێدانی بڵاوکردنەوە دەوەستێ بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ دەس‌بخاتە کاروباری ڕادیۆگەری ، بەڵام راسپێری ئەوە دەکات کە بایەخ بە بەرژەوەندی خەڵك بدەن‌و ئاستی ئێستگەی رادیۆ بەرزبکەنەوە (٩) ، لەگەڵ بوونی دەسەڵاتێکی مەڵبەندی کاروباری رادیۆگەری‌یەکان‌و مەسەلەی بازرگانی دەرەوە بەڕێوەبردن . ئەم ئێستگانەی رادیۆ لە ڕێگەی بۆزانین یاخود پێ‌بەخشین بەڕێوەدەچن .

ئەم شێوازە لەو دەوڵەتانەی کە سیستەمی ڕادیۆگەری بازرگانی دەگرنەبەر ، وەك وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو ئەرجەنتین‌و کەنەداو ئوسترالیا پەیرەودەکرێ .

**دووەم : هەڵوێستی بەجێی دەوڵەت دەربارەی دەزگاکانی بڵاوکردنەوە :**

لەم بارەوە ، دەوڵەت ڕاستەوخۆ دەزگاکانی بڵاوکردنەوە بەڕێوەدەبات‌و ڕێنمایی‌یان دەکات‌و پارەیان پێ دەدات ، لەگەڵ بایەخدان بە کردنی ئێستگەی ڕادیۆ بەهۆیەك بۆ هوشیارکردنەوەی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و ڕۆشنبیری‌و تەندروستی ، بە ئامرازێك بۆ پەلەلێ کردنی نەخشەکانی نەش‌ونماکردنی نەتەوایەتی هەڵوێستی بەئەرکی بەجێی دەوڵەت لەم دەزگایانەدا بەدانیی سەربەستی‌یەکی بەرپرسیاری فراوان دیاری دەکرێت ، لە ئامادەکردن‌و جێ‌بەجێ‌کردنی بەرنامەی بڵاوکردنەوە ، بە مەرجێ چاوەدێری‌یەکی خودی بەسەرەوە بێت ، لە هەمان کاتدا کە ئامادەکردنی پروگرام یا جێ‌بەجێ‌کەری هەست بە بەرپرسیاری خۆیی بکات ، لە چوارچێوەی ئەو سەربەستی‌یەی کە بۆی ڕەخساوە ، لە ئەنجامی باوەڕو هەڵبژاردنی ڕاست‌و درست ، بە دانانی کەسی لەبار لە شوێنی لەبار . بەلام بەرپرسیارانی ئەم دەزگایانەی بڵاوکردنەو ئەوانەی مامەلە ، لەگەڵیاندا دەکەن لە ڕووناکبیران‌و نووسەران ، نابێ بین بەو مووچەخۆرانەی کە قسەی گەورەکانیان دەڵێنەوە ، بەڵکو دەبێ هەریەك لەوانە بەرپرسیاری‌یەکی تەواو بگرێتە ئەستۆو لە بەجێ‌هێنانی ئەرکەکانی بە سەربەستی‌یەکی تەواو ، لە چوارچێوەی بەرپرسیاری‌یەکانی بەرامبەر کۆمەڵ دوور لە ترس‌و دوودڵی بکەوێتە کار .

دەوڵەت کە کاتێ هەل‌ومەرجی تەندروستی‌و دیموکراتی دێنێتە کایەوە بۆ کارکردنی ڕادیۆگەری سەربەست‌و بەرپرسیار ، ئەرکی ئیشکەرانی ئەم دەزگایانە تەرخان ـ کردنی هەڵوێستی بەئەرکی دەوڵەتە بۆ پێشخستنی کارو بەرزکردنەوەی ئاستی دەزگاکە ودوور لە کەوتنە ناو چاڵی بیرۆکراتی‌و هەڵپەرستی .

ئەو دەزگایانەی کە لە وڵاتەکانی سۆشیالیزم‌و زۆربەی ئەوانەی بەرەو سۆشیالیزم بەرێوەن‌و هەروەها ئەو دەزگایانەی بڵاوکردنەوە کە وەك دەزگایەکی گشتی بەرێوەدەبرێن بۆ خزمەتی کۆمەڵ ئەم شێوازە پەیڕەودەکەن .

## ٢ ـ تەکنۆلۆژیاو شارەزایی نیشتمانی :

سەدەی ئەمڕۆمان بە سەدەی زانست‌و تەکنۆلۆژیا دەدرێتە قەڵەم ، ئەویش لە ئەنجامی دەوری جیاکەرەوەی زانست‌و تەکنۆلۆژیا وەك لایەنێکی زیندەگی‌و دینامیکی ، لەبەر کارتێکردنی ڕاستەوخۆی لە کورتەی جموجووڵەکانی کۆمەڵ. زانیاریی زانستی‌و تەکنۆلۆژیا ڕاگیرگەی بنچینەیی پێشکەوتنی گەورەو خێرای دەوڵەتە پیشەسازە پێشکەوتووەکانەو ، ڕەگی ئەو زانیاری‌و شارەزایی‌یانە بەرەو ژمارەیەك سەدە درێژدەبێتەوە کە سەرجەمی گەلانی جیهان بەشداری‌یان لە پێ‌بەخشین‌و پێشخستنیان کرد(١٠) .

خۆ ئەگەر تەکنۆلۆژیا دەسکەوتی پەیڕەوکردنی بەڕاستی بێت لە چوارچێوەی پیشەسازی‌و بازرگانی دۆزینەوەو داهێنانە زانستی‌یەکاندا ، لەبەر ئەوەی کە پێشخستنی جۆرە تی بەرهەم‌و پترکردنی لەتوانادایە ، لە ئەنجامی پێشکەوتنی ئەو تەکنۆلۆژی‌یی کە پەیڕەوکردنی بەندە بەو دەوڵەتە پێشکەوتووانەی کە سوورن لەسەر ئەوەی بیخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان (١١) ، ئەوە شارەزایی نیشتمانی پشت بە ڕاهێنان‌و داهێنانی ڕێگەی کاریگەرتر و پرۆسیسی پێشخستنی پرۆژەو زیادکردنی بەرهەم ، دەبەستێ .

لێرەدا ،جیاوازی‌یەکی بێ‌ئەندازە لەنێوان دەوڵەتە پیشەسازی‌یە پێشکەوتووەکان‌و ، دەوڵەتە نەش‌ونماکەرەکان لە بواری تەکنۆلۆژیاو شارەزایی نیشتمانی‌دا هەیە . ئەم جیاوازی‌یە بێ‌ئەندازەیە لە تەوژمی ڕاگەیاندنی یەك ڕێبازا دەردەکەوێ کە بەڕوونی دەسەڵاتی دەوڵەتە پیشەسازی‌یەکان بەسەر وڵاتە نەش‌ونماکەرەکانەوە نیشان‌دەدات .

سەرەڕای ئەوەی کە ئەم وڵاتانە (کردنە قوتوەکان)ی ڕادیۆو تەلەفزیۆن‌و کەرەستەی تری ڕاگەیاندن لەکار دەکەن ، ژمارەیەك لەوانە ناتوانن پرۆگرامی تەلەفزیۆن مسۆگەر بکەن ، تەنیا بە هێنانەناوەوەی نەبێ لە دەوڵەتە پیشەسازی‌یە پێشکەوتووەکانەوە . بەپێی ئەو سەرژمێری‌یانەی کە یونسکۆ بلاوی‌کردنەوە ، لە ٨٤٪ ی پرۆگرامەکانی تەلەفزیونی گواتیمالا پشت بە پرۆگرامی لەدەرەوە هێنراو دەبەستن ، لە کاتێکدا سەنگافوورە لە ٧٤٪ و زیلەندەی نوێ لە ٧٥٪و مەلایزیا لە ٧١٪ و ئایسلەندە لە ٦٧٪ و زامبیاو نیجیریا لە ٦٤٪ و

ئوسترالياو يەمەنى ژووروو لە ٥٧٪ و كوێتو چيليو ئيرلەندە لە ٥٤٪ و عيراق ٥٢٪ و ميسر لە ٤١٪ و لبنان لە ٤٠٪ و مەجەرو فنلەنداو مەكسيك ونەرويج لە ٣٩٪ى ئەو پرۆگرامانەى بلاوى ئەكەنەوە لە دەروە دەهێنرێن (١٢) .

كۆڕەكانى ترى ڕاگەياندن لەم نامۆيىيە تاكە ڕێبازە دەرباز نەبوون ، ڕۆژنامەو كۆڤارو فيليمى سينەماو پرۆگرامى تەلەفزيونى هێنراو لە دەولەتە پێشەسازىيەكانەوە ـ بەتايبەتى بۆ ئەو وولاتە نەشونماكەرانەى كە تازە سەربەخۆبوونە پێشتر داگير كرابوون ـ وولاتەكانى ئەفەريقاو ئاسياو ئەمەريكاى لاتينى ڕادەماڵن ، بەجۆرێ ئەوەبو هۆى ڕێبازێكى ترسناكو تێدەكۆشێ كە لاساى نمونەى ڕۆشنبيرىى ڕۆژئاوا لە وولاتانى جيهانى سێيەمدا بكاتەوە ، وێڕاى توندكردنى ئاگاى خەلكى ئەم جيهانە لەسەر ئەو گيروگرفتانەى كە پەيوەندىيان بە ژيانى ڕۆژانەيانەوە نيە .

ئەمرۆ ڕاگەياندن بۆتە دەسەلاتى چوارەم ، بەلام ئەم دەسەلاتە تەكنيكىو سياسىيە لە يەك كاتدا لەبەر ئەوە داماڵينى مۆركى ئيمپرياليى لە ڕاگەياندن ، لە ڕێگەى گيرانەو ى هاوسەنگى ڕاگەياندنى دەولەتانو هاوكاريكردنى ناوخۆى دەولەتە نەشونماكەرەكانەوە نەبى نابێ ، لە پێناوى دامەزراندنو قووتكردنەوەل ئەو دەزگا ڕاگەياندنانەى كە دەتوانن تەوقى ئەو ئيمپرياليزمە ڕاگەياندنە تاكە ڕێبازە بشكێننو دابينكردنى خۆيى وەدەس بێنى .

ڕێكخراوەى يونسكۆ تەقەللاى ئەوە دەدات كە جياوازى بێئەندازە لە بوارى ڕاگەياندنى نێوان دەولەتە پێشەسازىيە پێشكەوتووەكانو دەولەتە نەشونماكەرەكان تەنگەبەر بكاتەوە ئەويش لە ڕێگەى داواكردنى گفتوگۆى نێوان ژووروو خواروودا ، بۆ گەڕاندنەوەى هاوسەنگى تەوژمى سەربەستىى ڕاگەياندنى دەولەتانو تەقەللادانى گواستنەوەى تەكنۆلۆژياو شارەزايى ڕاگەياندن لە دەولەتە دەولەمەندەكانەوە بۆ دەولەتە هەژارەكان ..

ئەو بانگەوازەى كە لە كۆنگرەى گشتىى يونسكۆ دەرچوو ، كە لە نايرۆبى (كينيا) لە سالى ١٩٧٦ بەستراو ، بانگەوازەكە جێبەجێكردنى بريارى كۆنگرەى بێلايەنى بوو ، كە سالى ١٩٧٣ لە جەزاير بەستراو تيايا بابەتى سيستەمى ڕاگەياندنى نوێى جيهانى خرابەپێشچاو ، ئەو بڕيارەى كە وەزيرەكانى دەرەوەى (٦٢) وولات لە وولاتانى بێلايەن كە سالى ١٩٧٦ لە نيودەلهى (هيند) كۆبوونەوەو پەسنديان كرد بۆ دانانى بنچينەى كارى ڕاگەياندنى هاوبەش لە ڕێگەى ليژنەيەكى ڕێكخستن بۆئەوەى ئەوە بخاتە بەردەمى جێبەجێكردن .

هەرچەندە دەمەقالێو ليكۆلينەوە لە كۆنگرەى فلۆرەنسا سالى ١٩٧٧ لەنێواى ڕاگەياندنخوازەكانى ١٣٨ وولات كرا لە هەر پێنج كيشوەرەوە هاتبوونو سالى ١٩٧٨ لە كۆنگرەى كۆلەمبۆو كۆرى گفتوگۆى عەرەبى ئەورووپى ڕۆژنامەنووسان كە سالى ١٩٨٠ لە بەغدا بەسترا ، دەولەتە پيشەسازىيەكان هێشتا هەلويستێكى توندو پتەويان هەيە لە ئاستى مەسەلەى سيستەمى ڕاگەياندنى نوێى جيهانى .

ئەم جياوازىيە لە توانستى دەولەتان لە خودى جێبەجێكردنى پيويستىيە ڕاگەياندنەكان ، بە شێوەيەكى ئاشكرا كاردەكاتە سەر كارى دەزگاكانى ڕاديۆگەرى ، بە پلەى جياواز ، بەجۆرى ڕۆربەيان ، جگە لە دەزگاكانى ڕاديۆگەرى لە دەولەتە پێشكەوتووەكان ، پرۆگرامى ڕاديۆو تەلەفزيونى ناوخۆ نابينن كە بتوانن بەهۆى ئەوانەوە گۆرانكارىيە كۆمەلايەكان لە وولاتەكانى خۆياندا وەدەسبێنن ، پەنا دەبەنە بەر لەكارهێنانى پرۆگرامى لە دەرەوە هێنراوو لەباتى گۆرانكارىيە كۆمەلايەتىيەكانى وولاتەكانيان ، وێنەى خانوو كۆشكو تەلارو ديمەنى خۆشىو ڕابواردن نيشاندەدەن بۆئەوەى لەجياتى نەشونماكردنى نەتەوايەتى بن لە وولاتەكانياندا .

### ٣ ـ كەنەبوورى نەتەوايەتىو ئايديۆلۆژىيەتى سياسى :

سينەمەكانى بلاوكردنەوە دەكەونە ژێر كارتێكردنى ئەو بارو زرووفەى كە لە وولاتەكانيادا هەن . ئەم بارو ـ زرووفانە هەلوێستى دەولەت لە پرۆسێى ڕاگەياندن بەشێوەيەكى گشتىو لە دەزگاكانى بلاوكردنەوە بەشێوەيەكى تايبەتى دياردەكەن ، جا ئەگەر مەلبەندىيەتى ڕاگەياندن پەيڕەوبكەن ياخود بيكەنە نامەلبەندىيەتى .

ئەگەر زياتر لە ٧٠٪ى دەزگاكانى

بڵاوکردنەوە لە جیهان لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەت بن (١٣) ، دەوڵەتە سۆشیالیزمەکان، نەشونماکەرەکان لە ٩٥٪ی ئەو ڕێژەیە دەبن ، بەڵام مڵکەچی ئەو دەزگایانە بۆ دەوڵەت ئەوە ناگەیێنێ کە لە لایەن دەوڵەتەوە بە مەلبەندیەتی ڕاگەیاندنەوە بەڕێوەدەبرێن . لە زۆر لە کۆمەڵگایانی نەشونماکەرو سۆشیالیزم‌و سەرمایەداریدا دەزگای ڕادیۆگەری هەیە لەبەر بارودۆخی نیشتمانی‌یان لە ڕێگەی نامەلبەندیبە ڕاگەیاندنەوە بەڕێوەدەبرێن ، وەکو هەمەنەتەوەو ڕۆشنبیری (هەروەك لە

یۆغۆسلافیاو بەلچیکادا ) هەیە یاخود بەهۆی ئایدیۆلۆژی سیاسی‌یەوە کە دەوڵەت ملی بۆ کەچدەکات وەك وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا . یاخود لەبەر بوونی دەزگای ڕادیۆگەری هەمەجۆر لە هەموو لایەکی وڵاتدا وەکو سویسرەو ئەڵمانیای یەکیەتیی یاخود لەبەر بوونی دەزگای ڕادیۆگەری کە جەماوەر لەگەڵ خاوەنەکانیان بەشداری‌دەکەن لە مولکداری‌یەتی کردنیان وەك ئەوەی کە لە فلیپیندا هەیە (١٤) .

ئەگەر مەترسی توند لە ترسی کۆمونیست کە پاش بیستەکانی ئەم سەدەیە لە ئەوروپادا بڵاوبۆوە ، بووە هۆی ئەوەی کە ئیتالیاو یۆنان‌و ئیسپانیا هۆیەکانی ڕاگەیاندن جڵەوکێش بکەن بەتایبەتی رادیۆ(١٥) . کۆتایی شەڕی دووەم بووە هۆی دەسەڵات سەپاندنی زۆربەی دەلەتانی جیهان بەسەر دەزگاکانی بڵاوکردنەوە

لەبەرئەوە (١١٦) دەڵەت لەناو (١٦٦) دەوڵەتانی جیهان، دەزگای ڕادیۆگەری‌و تەلەفزیۆنی هەیە ، تیایاندا ئەو دەزگایانە لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتن (١٦) .

ئەگەر جۆرمەندیی سیستەمی ڕادیۆگەری کە لە جیهاندا هەن بەڵگەیێ بێ بۆ جیاوازی کەلەپووری نەتەوایەنی‌و ئایدیۆلۆژیی سیاسی لە کۆمەڵگای ئەو دەوڵەتانەدا ، ئەوە ڕێبازی گشتی بەرەو پێدانی قیستیکی زیاتر لە سەربەستی‌ی کاری دەزگاکانی ڕادیوگەری دەڕوات ، بەجۆری لە نامەلبەندی یەتی‌ی بەڕێوەبردن زیاتر نزیك‌دەبێتەوە ، لەگەڵ دان‌نان بە دەسەڵاتی دەوڵەت بەسەریانەوە ، ئەویش لە ڕێگەی دەستە گشتی‌یەکان یاخود دەستە

هاوبەشەکانەوە « لە کەرتی گشتی‌و تایبەتی » بۆ ساغ‌کرونەوەی ئەوەی کە ئەو دەزگایانە خزمەتی بەرژەوەندیی گشتی دەکەن بە چاکترین شێوە . هەرچەندە ئەو دەستانە کەوتوونەتە ژێر کارتێکردنی بەندەکانی دەستوور وەك لە ئەڵمانیای یەکیەتیی ، یاخود جیاوازی رۆشنبیری وەك لە بەلچیکا یاخود کۆمەڵانی ئاینی وەك لە هۆلەندە (١٧) . بەڵام هەندێ دەوڵەت هەرچەندە دەسەڵاتیان بەسەر دەزگای ڕادیۆگەری‌یەوە هەیە ، توانیان ئەو دەزگایانە بکەنە بەڕێوەبردنی نامەلبەندیەتی ، چونکە لەو باوەڕە دان کە ئەم سیستەمە بەڕێوەبردنە خزمەتی کەلەپووری نەتەوایەتی‌و سیاسی‌یان دەکات وەك لە یۆغۆسلافیا .

ئەگەر بڕوایەکی هەڵە لەناو

ئیمپریالیزم‌و لیبرالیست‌دا ێ کەهەر دەبێ ڕژێمەکانی سۆسیالیزم بەتەواوەتی جڵەوی هۆیەکانی ڕاگەیاندن‌و بەڕێوەبردنی مەلبەندی‌یەتی بەهێزیان بگرنە دەس ، ئەوە دەزگاکانی ڕادیۆگەری لە کۆماری یۆغۆسلافیای یەکیەتی، دەزگای ڕاگەیاندنی نامەلبەندیەتی ، بەشێوەی لەخۆوە بەڕێوەچوون لە لایەن لێژنەکانی ڕادیۆو تەلەفزیۆنەوەو لە کۆمارە یەکیەتیی‌یە شەشەکەو هەردوو ناوچەی ئۆتۆنۆمی‌دا هەڵدەسوورێنرێن . لەبەر ئەوە لە یۆغۆسلافیا هەشت دەزگای سەرەکی‌ی ڕادیۆو تەلەفزیۆن هەیە لەگەڵ (١٨٠) ئیستگەی رادیۆی ناوخۆ لە تۆڕی ڕادیۆو تەلەفزیۆنی یۆغۆسلافی

ڕێك‌دەخرێن ، بەڵام پرۆگرامی ئەم ئێستگانە بە تەواوەتی جیاوازیان لەگەڵ یەکتر هەیە ، چونکە هەر دەزگایەك لەم هەشت دەزگایانە خزمەتی ڕۆشنبیریی نەتەوایەتی دانیشتوانی هەر کۆمارێك لەو کۆمارانە یاخود ناوچە کانی ئۆتۆنۆمی دەکەن . بەڵام دەستەی بەڕێوەبردنی ئەم دەزگایانە لەو لێژنە گشتی‌یە پێك‌دێن کە کریکاران هەڵیان‌دەبژێرن سەرەڕای ئەندامانی هەڵبژێراو لە لایەن یەکیەتی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکانەوە . لە پاشان لێژنەی گشتی ، دەستەی بەڕێوەبردن هەڵدەبژێری ، کە ئەویش بەدەوری خۆی بەڕێوەبەری گشتی‌ی دەزگاکە هەڵدەبژێری(١٩) یۆغۆسلافیا لە ڕوانگەی ماددە (١٦٨)ی دەستوورەوە کە بەشێوەیەکی ئاشکرا «مافی ڕاگەیاندن»ی تێدا هاتووە ئەم سیستەمەی پەیڕەوکرد ، کە ئەوەی

دووپات‌کردەوە : «یاسا زامنی مافی هاووڵاتی دەکات کە ئاگادار بێ لەوەی کە لەناوەوە دەرەوە ڕوودەدەن ، لەو ڕووداوانەی کە سەبارەت بە ژیان‌و کاری یەوە گرینگن ، هەروەها بەو مەسەلانەی کە پەیوەندی‌یان بە بەرژەوەندی نیشتمانەوە هەیە ، بزانێ .

پێویستە ڕوژنامەو ڕادیۆو تەلەفزیۆن‌و هی تر لە هۆیەکانی ڕاگەیاندنی گشتی ، هۆی ڕاگەیاندنی ڕاستگۆو مەوزووعی‌ی ڕای گشتی بن‌و ، ڕاو بەیاناتی دەزگاو کۆمەڵەو هاووڵاتی‌یان بڵاوبکەنەوە ، کە بەرژەوەندیی گشتی ئەوە دەخوازێ کە ڕای گشتی ئاگاداریان بێت .

یاسا زامنی ڕاست‌کردنەوەی هەر دەنگوباسێ دەکات کە بڵاودەکرێتەوە ئەگەر زیانی مافو بەرژەوەندیی خەڵك یا ڕێکخراوەکان یا دەزگاکانی هەبێ (٢٠) .

هەروەها دەستووری یۆغۆسلافی لە ماددەی (١٧١)ی‌دا زامنی مافی ڕۆشنبیریی نەتەوەکانی کردووە : « ڕۆڵەکانی نەتەوە ، بەپێی دەستوورو یاسا ، مافی ئەوەیان هەیە ، لە کاتی پەیڕەوکردنی مافو ئەرکەکانیان .

زمان‌و نووسینی خۆیان بەکاربێنن ، هەروەها لە معاملەکانیاندا لە لایەن میری‌و ئەو ڕێکخراوانە کە وەزیفەی گشتی دەبێنن .

ڕۆڵەکانی گەلان‌و نەتەوەکانی یۆغۆسلافیای سەر زەویی گشت کۆماری یا هەرێمێکی ئۆتۆنۆمی دار مافی ئەوەیان هەیە کە بەپێی یاسا بە زمانی زگماکی خۆیان بخوێنن » (٢١)

بیردۆزەی سۆشیالیزمی یۆغۆسلافی لەڕووی بەڕێوەچوونی خۆیی‌و نامەلبەندی‌یەتی‌ی ڕاگەیاندنەوە بەپێچەوانەی بیردۆزەی سۆشیالیزمی سوفییەتی‌یە کە ڕای وایە ، نامەلبەندیەتی ڕاگەیاندن ، بەتایبەتی لە بواری ڕادیۆو تەلەفزیۆن‌دا ، دەبێتە هۆی هۆگریی ڕۆشنبیری‌و یەکیەتیی بیر ، سەرەڕای پووچەڵ‌کردنەوەی ـ واتە بیردۆزەی یۆغۆسلافی ـ ئەو قسەو قسەڵۆکانەی کە دەڵێن سیستەمەکانی ڕادیۆگەریی سۆشیالیزم گوێ نادەنە ئارەزووی کۆمەڵانی خەڵك ، بەڵکو تەنیا بایەخ بە جێبەجێ‌کردنی ئامۆژگاری‌یەکانی دەسەڵاتی حوکمران‌و وەدەس‌هێنانی ئامانجە ئایدیۆلۆژی‌یەکانی ڕژێم دەدەن ، چونکە ڕێبازی یۆغۆسلافی لە ڕاگەیاندنی نامەلبەندی‌بەتی سوودی خۆی سەلماندلە گەشەپێدانی ڕۆشنبیریی نەتەوەکان‌و وەدەس‌هێنانی یەکیەتیی نیشتمانی‌و برایەتی نەتەوایەتی‌و برواسازکردن . سەرەکی کۆچ‌کردووی یۆغۆسلافی لەم ڕووەوە دەڵێ : «چارەسەرکردنی مەسەلەی نەتەوایەتی دەسکەوتێکی مەزنە دەشێ ئێمەی کۆمونیست هەردەم‌و بەڕاستی شانازی پیوەبکەین ، بەڵام لەسەرمان پێویستە بەشێوەیەکی تایبەتی پارێزگاری ئەم بڕوایە بکەین لە قۆناغی داهاتوودا بۆئەوەی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی‌ی سۆشیالیزمان پێشکەوی کە دەبێ لەگەڵ ڕەوتی پێشکەوتنی ڕاست‌و دروستی پەیوەندی‌یەکانی نەتەوایەتی‌ی ناو خێزانەکەمان بڕوات . ناوەڕۆکی ئەو پەیوەندی‌یانە دەبێ بەو شێوە بێ کە یەکیەتی‌و برایەتی‌ی نێوان گەلەکانمان زۆر زیاتر بکات . بەڵام هەندێ کەس هەن تەنانەت لەناو کۆمۆنیستەکانیشەوە ، ئەم دروشمە بەهێنرەی کە ئێمە لە تێکۆشانی ئازادیخوازانەی خۆمان‌دا بەرزمان‌کردۆتەوە ، پەستیان دەکات . ئەوان و دەزانن کە نەتەوەکان لە سایەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیی سۆشیالیست‌کاتیان تێپەڕێ‌و دەبێ لەناو بچن . ئەمانە نێوانی یەکیەتیی گەلان‌و پاکتاوکردنی نەتەوەکان‌و دروست‌کردنی شتێکی نوێی دەسکرد تێکەڵاودەکەن ، واتە تاکەنەتەوەیەکی یۆغۆسلافی . ئەمە تا ڕاددەیەك لە پرۆسیسی هەڵمژین‌و مەڵبەندیەتی بیرۆکراتی‌و ڕێبازی یەککردن‌ی دەسەڵات‌بەسەردا گرتن دەچێ ، تەواوکاریی سۆشیالیستی یۆغۆسلافی نموونەیەکی نوێی خێزانی کۆمەڵایەتی‌یە ، کە هەموو نەتەوەکان بەرژەوەندیی هاوبەشی خۆیانی تیدا دەبینن ، من ئەوە دەزانم کە لێرە مەسەلەکە تەنیا پەیوەندیی بە ڕۆڵەکانی گەلەوە هەیە ، بەڵام ئەو جۆرە کەسانە دەتوانن زیانێکی گەورە ببەخشن ، ئەگەر ئەو جۆرە کەسانە لەناو کۆمەڵەی کۆمۆنیستەکاندا هەبن ، دەبێ ئەوە بڵێین کە نابێ لەناو کۆمەڵەدا شوێنیان هەبێ ، چونکە زیان‌بەخشن » (٢٢)

پەیوەندی‌یەکی بەهێز لەنێوان ڕواڵەتی ئایدیۆلۆژی سیاسی‌و ڕواڵەتی کۆمەڵایەتی کەلەپووری نەتەوایەتی‌و ڕۆشنبیریی

مرۆڤایەتی‌دا هەیە ، کە سیستەمە هەمەجۆرەکانی بڵاوکردنەوە پەیڕەوی‌دەکەن ؛ یاخود لە ڕێگەی واتای بنەڕەتی هاوبەشی ئەم کەلەپوورە زۆرو زەبەنگەی بیروباوەڕو ئەو بەهایانەی کە بەرگری لە مافی مرۆڤ‌و شەرەفی دەکەن‌و داوای برایەتی‌و لەیەك گەیشتن‌و خۆشەویستی دەکەن .

ریچارد ماككیون

له لێکۆڵینەوەکەی خۆی لە هەڵویستی فەلسەفە ـ بەرامبەر هەمەجۆرەتی ڕۆشنبیری‌دا دەڵی : «کۆمەڵ یاخود دەوڵەت ـ واتە یاسای ڕای گشتی‌و یاسای دانانی ـ دوو کاری توند بەیەکەوە بەستراون ، هەر یەکەیان کارتێکردنێکی دابڕ دەکەنە سەر ئەوی‌تر ، دەوڵەت مافی بارەکی لەگەڵ مەرجە کۆمەلایەتی‌یەکان‌و لەگەڵ ئەو ڕایانەی کە لەئارادان کە دەربڕینی هەردووکیانن ، تەبان ، دەشێ دەوڵەت‌و مەرجە کۆمەلایەتی‌یەکان بگۆڕێن هەرچەندە لە ماف‌و نەریت‌دا ویشکی هەیە . مافی بارەکی‌و دەستوری دەوڵەتی لەوانەیە بە پەسندکردنی دەتی یاسادانان بگۆڕێن ، یاخود بە لێکدانەوەی دادپەروەری ، یاخود بە شۆڕشێکی سەرکێش . بەلام یاسای ڕا دەشێ بە گۆڕانی ناوەوە یاخود بەپێی کارتێکردنی دەرەوە بگۆڕێ‌و ، هەر گۆڕانێك لە یەکێکیاندا ڕوویدات گۆڕان ئەوی‌تریش دەبێ . کە کاتێ کاری سیاسی لەگەڵ ئەم گۆڕانەرا ناکۆك دەبێ یاخود کاتێ بەربەرەکانی دەکات ، هەر دەبێ لە لایێ بەرەنگاری کارەکانی کۆمەلایەتی ڕۆشنبیری ببێت ، واتە بەو کارانەی کە ئەو جوارجێوە سازدەکەن کە لە سنوورەکەیدا دەستخستنە ناوی سیاسی پێك‌دێ ؛ هەروەها لە لایەکی تردا بەرەنگاری کارەکانی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی‌ی ڕۆشنبیری دەبێت . ئەو کارانەی کە دەشێ ڕووبکەنە مەبەستی تر . (۲۳)

ڕادیۆ سەربەستی هەڵبژاردنی پرۆگرام‌و ئێستگەکانی بە گوێگر بەخشی ، پاش ئەوەی توانی سنوورەکان هەڵوەشێنێتەوە . بەلام نەیتوانی هەمان سەربەسی بە ئامادەکەرو جێبەجێ‌کەرانی پرۆگرامەکان بدات ، لەبەر دەسەلاتی دەوڵەت بە سەرەوەیانەوە ، لەبەر ئەوە ڕادیۆ جوارچێوە سازدەکەن کە لە پەیڕەودەکات ، کە کاتێ پرۆگرامەکانی لە ڕادیۆ نهێنی‌یە ڕووڕەشەکانەوە بڵاودەکاتەوە ، کە ئیمپریالیزمی جیهانی دژی هەردوو جیهانی سۆشیالیست‌و سێ‌یەم بەرێوەدی دەبەن . کەچی ئەو سەربەستەیە بێپێ هۆشمەندە دەبێ دەربارەی ئەو ڕادیۆ ڕوو سوورانەی کە بزوتنەوەی رزگاری لە جیهان بەرێوەیان دەبات .

لێرەدا ، جیاوازی ئایدیۆلۆژیەتی سیاسی دەبێتە هۆی جیاوازی بۆچوونی سیستەمەکانی ڕادیۆگەری‌و جۆرەها مەسەلەی ناوخۆو درەوە .

بەلام ، لەگەڵ ئەم سەربەستی‌یە بەئاستەمەی کە دراوەتە ڕادیۆ نهێنی‌یەکان ، کەچی شەڕەکە لەنێوان دەسەلاتی سەرپەرشتی‌کەری سەر ڕادیۆو نێوان ئەو دەستانەی کە بەڕێوەی‌دەبەن بەردەوام دەبێ لە پێناوی وەدەس‌هێنانی باروزروفێك کە سەربەستی زیاتر مسۆگەر دەکات بۆ کاری ڕادیۆگەری دروستکەری داهێنەر ، لەگەڵ دووپاتکردنەوەمان بە ردت‌کردنەوەی بیری پێدانی ئەوپەڕی سەربەستی‌ی کاری ڕادیۆگەری ، چونکە لەگەڵ کاری ڕاگەیاندنی بەڕاستی‌و بەرپرسیار ، بەتایبەتی ، لە بواری ڕادیۆدا ، ناگونجێ .

# جوانی نهێنی یەکانی گوڵ و گوڵە ڕەنگینەکان



**ئازاد عبدالله صدیق**

هەموو شتێکی جوان .. جوانە وەك گـــوڵ ،
ووشتێکی پاك .. پاکە وەك گـوڵ ، پێویست بـــە
ەڵدانو دەرخستنی ، ڕوی ڕاستی ئـەو لایەنـە
خەین کە نیشتمانی شیرینو ڕەنگینمان بەهـــۆی
ە بەپیتو ئاوو هەوا سازگارو کانیو قەڵبــەردی
اوە کەللە تەزێنو شیرین جیاگەردن کەشەکانەوە
ای شینبوونو مەیدانـــی نـــاز فرمێسکو
دەرخستنو تەراتێنی هەمەڕەنگ گوڵو گوڵاڵەی
ر بە جۆری بۆنخۆشو ڕەنگینە .. بەڵام ئەوەی کە
ەرمازە پێویستە لەم ڕۆژگارە پڕ لــــە گۆڕانو
کەوتنە خێرایەی سەراپای جیهاندا بریتییە
دی کەوادەبێ سەروکاری ئـــەم گوڵە قەشەنگانە
ین ... نەك تەنها وەك هۆیەکی جوانیو پاکیو بۆنو
بەرامەی سەرمەستکەر سەیری بکـەین ... چونکـە
جیهانی بەرفراوانی گوڵ زۆر لایەنی شاراوەو گەلێـك
سوودی گرنگی بڕیایەخیشی هەیە بۆ مرۆڤ لـــەم
بارەیەشەوە بەپێـــــی تاقیکردنـەوە زانستــــیو
سایکۆلۆژییەکان دەرکەوتووە کـــەوا ( گوڵ وەکـو
دەرمـــانو چارەسەرکەرێکی باشــــی نەخۆشــــی
سایکۆلۆژی مێشك بەکار دەهێنرێ) .

ئەگەر بڕێك ئاوڕبەرەو دواپدەینەوە دەبینین : ـ

یەکێك لەزانا ناودارەکانی (چین) پێش هەزاران
ساڵ لەمەوبەر وتوویەتی : ـ

(ئەگەر دوو نانت هەبوو ... یەکێکیان بفرۆشەو
بە پارەکەی گوڵێك بکڕە ؛ چونکە ( نانـــی یەکــــەم

( میسری‌یە کۆنەکان گوڵیان لەگەڵ خۆیاندا بـردووە بۆ پەرستگاکانیان‌و لـــە ماڵەکانیاندا دایـــان ناوەو ماڵەکەیان پێ ڕازاندۆتەوە .. تەنانەت بڕێك جـار خۆشەویستی‌یان بەرامبە گوڵ لەمەش تێپەڕیـوەوە گەیشتۆتە ڕادەی پەرستن وەك پەرستنی جـــۆرە گوڵێك کە ناوی (گوڵی لۆتس)ە ،

لەکوردەواریشدا هەرچی بـــەڕەو ڕاخـــەرو بەرهەمە فۆلکلۆری‌یە چنراوەکانمانە وێنەی گوڵـــی هەمەچەشنەیان تیا نەخشێنراوەو تاوەکـو ئێستاش لەبەر هەیوانەکانی گوندو شارە خنجیلانەکانی بڕێك لە ناوچەکاندا گوڵی هەمە چەشنەی وەك (ڕێحانەو لالە عەباس‌و لاولاوو ، هەمیشە بەهـــارو شەستپـەڕ دەڕوێنن) .

ئێستاش ... واتە لـەم سەردەمەدا مـرۆڤ کەوتۆتە لاسایی‌کردنەوەی سروشـت‌و لەهەمـــوو لاوە خەریکـــی دروست‌کردنی گوڵـی دەست‌کردە لە پلاستیك‌و شتی دیکە ..

## گوڵ سەرچاوەیەکی ئابووری‌یە

بێجگە لەوەی کەوا گـــوڵ خۆشی‌و جوانـــی دەبەخشـــێ بـە مرۆڤ .. لـە بازاڕی کڕیـــن‌و فرۆشتنیشدا لە مەیدانی ئابووری‌و بازرگانیشـــدا ڕەواجێکی باشی هەیە . لە زۆر شوێنی جیهانـــدا بازاڕی کڕین‌و فرۆشتنی هەیـــە ، چ بـــە شێوەی تۆویان شـەتڵ لە باخچەکاندا یان بە چەپـــك .. هتـــد

هەروەها گوڵ سەرچاوەی سەرەکی‌و یەکەمیـن کەرەستەی خـــاوی پیشەسازی بۆ نەخۆشـــی جۆربەجۆرە بەتایبەتی وولاتی (فەرەنسا) لەم بارەیەوە ڕۆڵێکی گرنگـو دەستێکی بالای هەیـەو ساڵانـــە دەسکەوتێکی باشی ئابووری دەستگیر دەبێ .

ولاتە پێشکەوتووەکان برەوێکی باشـــیان داوە بە گوڵ‌و تاڕادەیەکـــی تـەواو خۆیانی لەگەڵـــدا ماندوودەکەن‌و گرنگی‌یەکی گەلێك بلندی پێـــدەدەن بە چاندن ڕواندن‌و زۆرکردن‌و قەلاچۆکردنی ئـــەو نەخۆشی‌یانەی کە تووشی دەبـــن ... هەروەها بـە بلاوکردنەوەو ڕواندنی لە شوێنـــە گشتی‌یەکـــان‌و سەیرانگا خۆشەکاندا . بـەلام بەداخەوە لە ولاتـە دواکەوتووەکاندا برەێکی وا بە گوڵ نادرێت‌و نـرخ‌و بەهای گرنگی فەرامۆش کراوە .

## گوڵ‌و خواردەمەنی

زانستی نوێ ئەو ڕاستی‌یەی سەلماندووە کە گوڵ سوودێکی باشی هەیە بۆ خواردن‌و دەرمانێکی پـــر خواردەمەنی‌یە بۆ لەش بەلام دووەم خواردەمەنی‌یە بـۆ گیان .

## * گوڵ‌و زانستی دەروونی (سایکۆلۆژی)

جیهانی گوڵ تابلۆی جیهانێکـــی فـــراوان‌و دلگیرەو چەند لێکۆلینەوەو تۆژینەوەی زانســـتی‌و سایکۆلۆژی نـوێ بـــە دووردودرێژی چوونەتە نـاو قولایی جیهانی گوڵ‌و گولاڵەو ڕەنگەکانیانەوەو باســی کاریگەری گرنگی دەکەن بۆ سەر مرۆڤ .

پەیمانگای لێکۆلینەوەی گـــوڵ لە (شیکاگـــۆ) ڕایگەیاند کەوا گوڵی سوور یاریدەی چالاکی لـەش‌و هێمن کردنەوەی مێشك دەدات‌و هەروەها دەبێتە هۆی چالاکی لێدانی دڵ . جا لەبەرئەوە گوڵی سوور پتـر دەبرێ بۆ نەخـــۆش .. وەك لای خۆشمان بـاوە . زیاد لەمەش هەمان پەیمانگای ناوبراو ڕایگەیاند کـــە گوڵی ســـــوور ئارەزووی خواردن ئەکاتـەوەو وا لە مرۆڤ دەکات پتر حەز لە خواردن‌و خۆراك بکات . لەلایەکی دیکەشەوە سەلمێنراوە کـــە ڕەنگـی زەردو سەوزو سپی جۆرە پشوویەك دەدا بـە ماسولکەکانی لەش‌و دەبێتە هۆی ئارامکردنەوەو هێمنی‌و خـــەو لێخستنی مرۆڤ .

هەر لە کۆنیشەوە مـــرۆڤ خۆشەویستی‌یەکی بێ‌پەرواو پڕ سۆزی لەگەڵ گوڵ‌و گولاڵە دڵی فینەکاندا هەبووە لە سەرتاسەری ئەم جیهانەدا بـۆ ندوونە : ــ



سووده بۆ چارەبەکردنـــی نەخۆشی . وەلـــەم بارەیەشەوە هەوڵی بەردەوام و بێپەروا دراوەو ڕۆژ بە ڕۆژ پتر گەشەی پێدەدرێ . هەڵاڵەی گوڵ واتە (ئەو تۆزە وردەی کە لەسەر ئەندامی نێرینەی گوڵە کەوەیە) چەند جۆرە ڤیتامینێکی زۆرە تێدایە وەکو کۆمەڵەی ڤیتامیـــن و ڤیتامیـــن و تاکەشەکرەکان وپرۆتینات و چەند توخمی کانزایی دیکـەی هەمـــە چەشنی وەك (ئاسن و کالیـسیۆم وخـوێ .. هتـــد) تاقیکراوەتەوەکە وائەگەربێت و بڕێك لـەو هەڵاڵـــە (تۆزی ئەندامی نێرە)یە بکرێتە ســـەر خواردەمەنـی دەبێتە هۆی یارمەتیدانی هەرسی خواردنەکە بێجگـە لە وەش ڕیخۆڵە بەهێزتر دەکات و وەك دەرمانێکـی سەرکەوتووش بەکارهێنراوە بۆ چارەسەری ئـــەو منداڵانەی کە گەشە ناکەن و سستن لە گەورەبووندا . زۆر سەرکەوتوانە ش بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشـی کەم خوێنی (هیمۆفیلیا) بەکارهێنراوە .

دیـــان ئەگەربێت و (گوڵاو) کەلە گوڵ دەگیـرێ بکرێت بەسەر خواردەمەنیا بێجگە لەوەی کە تـام و بۆنێکی خۆشی دەداتێ سوودێکی هەرە بەرز و گرنگـی دیکـــەشی هەیـــە ئـــەویش پاکژکـــردنی خواردەمەنی یەکەیە ئێمە ئەگەر ئاوڕێك بە ڕابووردووی کۆمـــەڵەکەمانـــدا بخشێنین دەبینیـــن زۆر داب و ئادگاریان لە ناودا باوبووەوتاوەکو ئێستاش لـــە زۆر شوێندا ماوە ، کە لە کاروباری پزیشکی‌دا پشتیان بـــە گوڵ بەستبوو گوڵاویان دەگرتەوەو دەیان برژاند بەسەر نەخۆشەکاندا کە تەنها بۆ مەبەستی بۆنـــە خۆشەکەی نەبووە بەڵکو کاریگەری‌یەکی گرنگیشی هەبووە لەسەر کەمکردنەوەی بـــر دامرکانـــدنـــە وەی ئازاری نەخۆشەکە .

گوڵی پرتەقالیش بـــۆ ئارامکردنەوەی مێشك و دەمارەکانی سوودێکـی باشـــی هەیـــە جگەلەوەی کە باشتریـــن دەرمانیشـە بـــۆ ئەوکەسانەی تووشـــی کەمخەوی (خـــەوزڕان) دەبـــن لـــە شـــەودا . جاکەوایە با پتر ئاشنایی لەگەڵ گوڵدا پەیدابکەیـن و زیدەتر بچینە نـــاو ئـــەم جیهانـــە نهێنی‌یە وەو ڕەوی‌پێبدەین و هیوادارم هەموو گوڵ بن ... بـــەڵام تەمەنتان گوڵ نەبێ .

**سەرچاوەکان :ـ**


١ ـ گۆڤاری (الثـــورە الزراعیـــە )ژ (٢٢) ، (٢٣)

٢ ـ آفـاق جامعیە ژ (٣) سالی یەکەم ١٩٧٧




# ئیفلیجی منداڵ

٧

**ئامادەکردن و وەرگێڕانی**
**ابو بار حسین علی**

ئیفلیجی منداڵ نەخۆشی‌یەکی توندو گـەلێ مەترسی دارە دەماوی‌یە کە بە ئێرەی پەتایان تـــاك تاك ڕوو ئەدات و ئەتەنێتەوە .

ئەم نەخۆشی‌یە هەر تەنها تووشی منداڵ نابێ بەڵام بە زۆری تووشی ئەو منداڵانە ئەبێ کە تەمەنیـــان لە نێوان ( ٢ـ٥ ) ساڵاندایـــە .

هۆی تووشبوونی نەخۆشی‌یەکە بریتی‌یـــە لـــە سێ جۆر ڤایرۆس ، کە لە مرۆڤێکی توو شبووەوە بـــۆ مرۆڤێکی لەش‌ساغ ئەگوێزرێتەوە یان هەر لـــەڕێی ئەو کەمانەی کە نیشانەی نەخۆشی‌یەکەیان هەڵگرتووە بۆ کەسانی تر ئەگوێزرێتەوە ئەم گوێزانەوەیش لە ڕێی بۆری هەناسەدان و گەلێ شوێنی ترەوە ئەبێ . وەتوو شبوون بەیەکێك لەم سێ جۆرە ڤایرۆســـــە ، دژە بەرگری‌یەك ناداتە جۆرەکانی تـــر .

**گۆرانکاره پاتۆلۆجی‌یه‌کان :**

وه‌کو ووتمان ئایرۆسی ئه‌م نه‌خۆشی‌یه له ڕێگای هه‌ناسه‌دان‌و کۆئه‌ندامی هه‌رسه‌وه ئه‌گوێزرێته‌وه ، ئه‌مه‌ش له ئه‌نجامی کۆکه‌و پژمین‌و پریشکی ده‌مه‌وه ئه‌بێ وه‌ئه‌م ئایرۆسانه په‌لاماری ده‌ماغ‌و دڕکه مۆخ ئه‌ده‌ن به‌تایبه‌تی ناوچه‌ی مل‌و خالیگه‌و هه‌روه‌ها ئه‌م ڤایرۆسانه هێرشیش ئه‌به‌نه سه‌ر خانه‌کانی شاخی پێشه‌وه‌ی ده‌ماغ .

**ماوه‌ی هه‌ڵهێنان :**

ماوه‌ی هه‌ڵهێنانی میکرۆبی نه‌خۆشی‌یه‌که دیاری کراونی‌یه ، به‌ڵکو هه‌میشه له گۆڕاندایه ، به‌ڵام به‌زۆری له نێوان (٧ـ١٠) ڕۆژدایه ، وه‌هه‌روه‌ها ماوه‌ی ته‌نینه‌وه‌که‌ی (٦) هه‌فته ئه‌خایه‌نێ .

**قۆناغه‌کانی :**

ئه‌توانین ئه‌و قۆناغانه‌ی ناخۆشی‌یه‌که‌ی پیائه‌ڕوا بکه‌ین به چرار قۆناغه‌وه .

**١ ـ قۆناخی پێش ئیفلیجی :**

ئه‌م قۆناخه به قۆناخێکی توندو سامداری نه‌خۆشی‌یه‌که وائه‌نرێ ، چونکه له‌م قۆناغه‌دا ئایرۆسه‌کان له کۆ ئه‌ندامی ناوه‌نده ده‌ماردا زۆر ئه‌بن .

وه‌هه‌روه‌ها تیایدا هه‌ست به تایه‌کی توندو سه‌رئێشان‌و هێڵنجدان ئه‌کرێ . هه‌روه‌ها هه‌ست به ڕه‌قبرونی ماسرلکه‌کانی مل ئه‌کرێ ئه‌ویش له ئه‌نجامی ئه‌و ڕوروژانه‌ی له ده‌ماخه په‌رده‌دا ڕوو ئه‌دات ، ئه‌مه بێجگه له‌و ئازاره‌ی که له‌پشت‌و په‌له‌کاندایه هه‌یه .

**٢ ـ قۆناخی ئیفلیجی :**

ئه‌م قۆناخه‌ی نه‌خۆشی یه‌که‌یه‌وه له قۆناخه‌کانی تری جیا ئه‌کرێته‌وه که خاوبوونه ئیفلیجی‌یه‌ك له نه‌خرشه‌که دا ڕووئه‌دات له‌گه‌ل نه‌مانی په‌رچه‌کرداره ـ کان وه زۆر جار ئیفلیجی‌یه‌که به ئێره‌یه‌کی خێراو نارێك‌و پێك‌و کوتوپڕ ڕوو ئه وات . ئه‌مه بێجگه له‌بوونی ئازار له ماسولکه‌کانداو له‌گه‌ڵ ڕوقبرونی ئه‌و ماسوولکانه‌ی که ئیفلیجی‌ی لێی نه‌داون . وه‌له‌ماکه پڕ مه‌ترسی‌یه‌کانی ئه‌م قۆناغه ئه‌وه‌یه که تروشی کۆ ئه‌ندامی هه‌نا سه‌دان ئه‌بێت . وه سێ جۆر ئه‌م ماکانه (لێپیسه‌کردن) له کۆ ئه‌ندامی هه‌ناسه‌داندا ڕوو ئه‌دات :

١ ـ

ئه‌م حاڵه‌ته له ئه‌نجامی ئیفلیجبوونی ئه‌و ماسوولکانه‌ی یارمه‌تی قووتدان ئه‌ده‌ن ڕوو ئه‌دات، وه له ئانجامی هه‌ڵنه‌سانی ئه‌م ماسوولکانه به فرمانه‌کانیان لیکاوێکی (ده‌ردراوێکی) زۆر کۆئه‌بێته‌وه که ئه‌بێته هۆی ئه‌م لێپیسکردنه . وه‌له‌م باره‌دا پێویسته نه‌خۆشه‌که به‌ده‌مدا پاك نجرێت‌و سه‌ری بۆ خواره‌وه شۆڕ لکرێته‌وه ، بۆ پاککردنه‌وه‌ی ئه‌و پیسایی‌یانه‌ی که‌هه‌یه‌تی ، وه‌هاروه‌ها پێویستی به‌ده‌زگایه‌کی ڤرۆك (جهاز ماص) هه‌یه بۆمژینی ئه‌و ده‌ردراوانه.

٢ ـ

ئه‌مه‌ش ئیفلیجی‌ی ماسوولکه‌کانی کۆ ئه‌ندامی هه‌نا سه‌دان ئه‌گرێته‌وه . وه‌له‌م باره‌دا منداڵه‌که پێویستی به ده‌زگایه‌کی هه‌ناسه‌پێدان (تنفس صناعي) هه‌یه .

٣ ـ

ئه‌مه‌یان هه‌ر دوو حاڵه‌ته‌که‌ی لێپێشوو ئه‌گرێته‌وه

وه‌له‌م حاڵه‌ته دا پێویسته بۆری‌یه‌کی هه‌وایی بخرێته بۆری‌هه‌وایی نه‌خۆشه‌که‌وه . وه‌ئه‌وه‌ی پێویسته‌و جێگای بایه‌خ‌پێدانه له‌م قۆناغه‌دا بکرێت . بایه‌خدانه به سنگ‌و وه‌هه‌روه‌ها بۆ ئاسان کردنی هه‌ناسه‌دان، پێویسته ئه‌م کارانه‌ی خواره‌وه به‌جێ بهێنرێن .

**١ ـ به‌زمانی عه‌ره‌بی (سرح الوضعی) پێیه‌ئێن :**
**( پاککردنه‌وه‌ی سنگ له به‌لغه‌م‌و پیسایی ئه‌ڕێ‌یه‌وه)**

ئه‌مه‌ش بریتی‌یه له‌چۆنیه‌تی پاڵخستنی نه‌خۆشه‌که له باشترین‌و گونجاد ترین بارو دۆخدا به‌مه‌رجێ بۆری هه‌وایی به ئێوه‌یه‌کی ستوونی بێ وه‌ئه‌م حاڵه‌ته‌ش پشت به شوێنی پلی سووتاوه (الفص الملتهب) کردو ئه‌به‌ستێ .

ب ـ ته‌پ ته‌په‌یه‌کی (لێدانێکی) هێمن له‌سه‌رخۆی سنگ ، له‌گه‌ڵ په‌ستان خستنه سه‌ر سنگ له‌کاتی هه‌ناسه‌دانه‌وه‌دا .

ج ـ یارمه‌تی دانی نه‌خۆشه‌که له‌کاتی کۆکیندا .

**٣ ـ قۆناخی به‌ره‌و چاکبوونه‌وه :**

وه‌ئه‌م قۆناغه به‌رده‌وام ئه‌بێ مادامه‌کی هه‌ست به باشبوونێك له ماسولکه ئیفلیج بووه‌کاندا ئه‌کرێ .

**٤ ـ قۆناخی پاشماوه‌ی ئیفلیجی یه‌که :**

کاتی نه‌خۆشه‌که ئه‌گاته ئه‌م قۆناخه که هیچ دیارده‌یه‌کی باشبووت یان چاك بوونه‌وه له ماسوولکه ئیفلیج‌بووه‌کانیدا نابینرێ ، وه‌له‌و پاشماوانه‌ی نه‌خۆشی‌یه‌که که ئه‌توانین دیاری بکه‌ین ئه‌مانه‌ن (لاوازی ماسولکه‌کان‌و کورتی په‌له‌کان‌و شێواندنی جومگه‌کان)ه .

**خۆپاراستن :**

بۆ خۆپاراستن لەم نەخۆشی‌یە پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکرێ :

١ ــ پاککردنەوەو پشکنینی دەردراوەکانی قوڕگ‌و پیسایی نەخۆشەکە بۆ ڕزگاربوون‌و لەناوبردنی ڤایرۆسی نەخۆشی‌یەکە .

٢ ــ کوتاندنی مندان دژی نەخۆشی‌یەکە بە لوقاحی تایبەتی لە جۆری (سابین ــ ) کە ئەمەش بەسێ جار لەڕێگای دەمەوە بەمنداڵەکە ئەدرێت . بەم جۆرە :

ا ــ تومی یەکەم کەلە تەمەنی چوار مانگی‌یەوە ئەیدرێتێ .

ب ــ توحی دووەم پاش (٤ ــ ٦) هەفتە دوای تومی یەکەم ئەیدرێتێ .

ج ــ قومی سێ‌هەم پاش (٤ ــ ٦) هەفتە دوای قومی دووەم ئەیدرێتێ ئەمە بێجگە لەوەی کە لە تەمەنی (١٨) مانگیدا قومێکی چالاك‌و بەگوڕی ئەدرێتێ‌و لە تەمەنی چوونە قوتانجانەاشدا دووەم تومیشی پێ ئەدرێ .

٣ ــ دوورخستنەوەی ئەو کەسانەی کە لەگەن نەخۆشەکەدا ئەژین‌و هەڵی‌وکەوتی لەگەڵدا ئەکەن .

٤ ــ باکژکردنەوەی ئەو خۆراکانەی کە ئەیخۆێن‌و هەروەها پاکلژکردنەوەی چك‌و بەرگی نەخوشەکە .

**چارەسەرکردن :**

چارەسەرکردن لەم نەخۆشی‌یەدا زیاتر پشت بەتووندی بلاوبونەوەی‌و هەروەها ئەو قۆناغانەی کە نەخۆشەکەی تیادایە ئەبەستێ . بۆ نموونە لە قۆناغی پێش ئیفلیج بووندا نەخۆشەکە پێویستی بە حەوانەوەو داو دەرمانێکی هێمن کەردوە هەیە . بەلام لە قۆناغی دووەمرا واتە لە قۆناغی ئیفلیج بووندا چارەشەکردن بەم شێوەیە ئەبێ :

١ ــ بایەخدان بە سنگ‌و بەکۆ ئەندامی هەناسەدان .

٢ ــ بەکارهێنانی دەرمانی هێمن‌کەرەوە وەکو (اسبلین‌وپاراستیامۆل )

٣ ــ بەکارهێنانی تەزووی بجر . بچڕی گلڤانیك بۆ هاندانی (تحفیز)ی ماسوولکە ئیفلیج‌بووەکان یان تووشبووەکان .

٤ ــ جووڵاندن‌و تەمرین پێکردنێکی لەسەر خۆی ئەندامە تووش بووەکان بە بەردەوامی ، بەمەرجێ لەتوانستی نەخۆشەکەدابێ‌و نەبێتە هۆی ئازار پێگەیاندنی ، ئەم کارەش چارەسەرکەری سروشتی پێی هەڵدەستێ نەك نەخۆشەکە خۆی .

٥ ــ خراپ ڕاگرتن‌و خراپ بەکارهێنان‌و جووڵاندنی ئەندامەکان کە ئەمە گرژبوونێك لە ماسرولکەکانی ئەو ئەندامانەدا دروست ئەکات . وەلەم باردا هانا ئەبرێتە بەرگەچ تێکرتن وپاڵیشتی تایبەتی بۆ چوونەشوێن خۆی ئەو ئەندامانەو ڕێك ــ بوونەوەیان .

**٦ ــ شێلاندنێکی دەست‌پیاراهێنانانە**

ئەندامە تووشبووەکان ، ئەمیش دوای بەکارهێنانی تەزووی بجر بچڕی گلڤانیك بۆی ئەکرێت ، وەوا باشیشە بۆدرەو زەیتیشی لەگەڵدا بەکاربهێنرێ بۆ ئەوەی دەرفەتی لێك‌خشاندن لە نیوان پێستی نەخۆشەکەو دەستی چارەسەرکەرەکەدا کەم بێت .

**٣ ــ قۆناخی چاك بوونەوە :**

ئەم قۆناغە بەگرنگرین قۆناخ ئەژێردیت لە نەخۆشی‌یەکەدا . وپێویستە ئەو شێواندن‌و گرژبوونەی کە لەوانەیە لە ئەندامەکاندا ڕووبدات دەستی بەسەرا بگیرێ وبن‌بڕبکرێ . ئەویش لە ڕێی تەمرین پێکردنێکی ڕاست‌و تەواوە لەسەر خۆی ئەندامەکان بە بەردەوامی .

**٤ ــ قۆناغی پاشماودی ئیفلجی‌یەکە :**

ئەگەر پاشماودی نەخۆشی‌یەکە لە نەخۆشەکە دا مابێ ئەوا چارەسەرەکەی پشت بەچۆرد سروشت‌و توندو تیژی ئەو پاشماوە ئەبەستێ . وەلەم بارەدا سوود لە گەچ تێکرتن‌و پاڵێشت وەرئەگیرێ . ئەمە بێجگە لەوەی کەئەبێ بە شێوەیەکی بەردەوام چاودێری نەخۆشەکە بکرێ‌و ناو ناویش فەحس بکرێت ، تا بەتەواوی پلەی چاك‌بوون‌و خراپ‌بوونی نەخۆشەکە بزانرێت .

**سەرچاوەکان :**


موحازەرەیەکی دکتۆر (مزهر الطحان) لەوانەی (الامراض الباطنیه)دا کە سەرچاوەی سەرەکی باسەکەیە .

٢ ــ الصحه العامه والخدمات الصحیه

٣ ــ موحازەرەیەکی دکتۆر (نوری مصطفی بهجت) لەوانەی (العلاج الکهربائی)دا .

٤ ــ امراض الاطفال ا. کولطیبین ، ز. لانجرفوی ، ف. فلاسوف دار «میر» موسکو ١٩٦٩ .

٥ ــ لەگەڵ چەند سەرچاوەیەکی تریش .



# دۆزینەوەی دەرمانێـــك بـــۆ کوتـــان دژی ڤـــیرۆس «ب»

زەردویی یان زەرتك لەو نەخۆشیی بـــــە ترسناکانەیە کە پێویستە لە هەردوو ئاستی ناوچەیی و نێودەوڵەتاندا بەرەنگاریی بکرێت و ، هەرچەندە تـــا ئێستا چارەسەریی نیە ، بەڵام ئـــەو تاقی کردنەوانەی ئێستا لە میونیخ و ئەمەریکاو ئەفەریقیا دەکرێن بوونەتە هۆی دۆزینەوەی دەرمانێکی کوتان دژی ڤیرۆس «ب» و هەروەك کۆنگرەی پانزەهەمی نەخۆشیەکانی گـــەدەو جگەر کە لە هامبۆرگ بەسترابوو ، رایگەیاند کە لـــە سالی (١٩٨١)دا دەرمانەکە دەکەوێتە بازارەوە ، ئەگینا تاکو ئێستا هیچ دەرمانێك بۆ چارەسەرکردنی ئـــەم نەخۆشیی بە نەدۆزراوەتەوە ، وە نازانرێت تـــا چ رادەیەك ئەم دەرمانی کوتانە کاریگەرە ؟!

زەردبوونی دەموچاو ، دڵ خواردن نەبردن و کەم خۆریی ، کەمـــی گەرمی لەش ، ئێش و ئازارو لـــەش ماندووبوون ، زەردبوون و ســـپی بوونی پیســـایی .. بەڵگەی توشبوونی ئەم نەخۆشیی بەن .

**جۆرەکانی زەردویی**

زەردویی کۆمەڵێك نەخۆشی دەگرێتـــەوە ، یەکەمین بەڵگەی تووشبوونی ئەم نەخۆشـــیی بە ، زەردهەڵگەڕانی رەنگی دەموچاوو پەردەی تەنکـــی ناو لووتەو لە ئاکامی کۆبوونەوەی «بیلیرۆبیـــن» لە خوێن دا روودەدات .

شانەکانی جگەر ، زەرداو دەڕژێنە سەر شیوەر «ڕێژگە»ی جگەرو لەوێشەوە بۆ چیکلدان. جا لەکاتی هەرس‌کردندا ـ چیکلدان بە ناوەڕۆکەکەیەوە ـ دەبنێرێتە ریخۆلەو لەگەل خۆراکا تێکەلاونەبێ‌و یارمەتی هەرس‌کردن دەدات .

زەرتك چەند جۆرێکە : هەن لەرێگای گیرانی ڕێژگەی جگەرەوە ، لەئاکامی شێرپەنجە داشتن ، پەیدادەبێ . هەشە لەئاکامی ئاوسانی جگەر پەیدادەبێ .

خەلك بەهۆی «ڤیرۆس » یا «میکرۆب» تووشی نەخۆشی زەردویی یان زەرتك دەبن ، ئەمیش دوو جۆرە : ڤیرۆس (ئەی) ، ڤیرۆس (بی) .. ڤیرۆس (ئەی) تووشی منالانی ئەو ناوچانە دەبێ کە ئاووهەوایان فێنکە . وە هەروەك نەخۆشی گرانەتا لەرێگای ئاوو خواردندا تووشی مرۆڤ دەبێت‌و بۆ ماوەیەکی کەم لە لەش‌دا دەمێنێتەوە ، لەپاشان لەگەل پیسایی فرێدەدرێتەوە دەرەوە .

ئەو کەسەی تووشی ڤیرۆس (ئەی) دەبێ ، تەنیا بەرگەی دژی ئەم جۆرە دەبێت‌و لە خوێنیدا نامێنێتەوە . ئەم بەرگەبوونەش لەتوانای لەشی ئەو کەسانەدا هەیە کە تەمەنیان لە چل سالی‌و بەولاوەیە. بەلام لە ڤیرۆس (بی)دا ؛ بە پێچەوانەی ڤیرۆس (ئەی) خەلك لەرێگای خوێن‌و حوقنەو پێوەدانی جانەوەرو پەیوەندییەکانی سیکسی‌و زۆر جاریش بەهۆی ئاوەوە ، تووشی دەبێت .

ئەم «ڤیرۆس» ەش بۆ ماوەیەکی زۆر لە خوێن‌دا دەمێنێتەوە . هەتا هەندێ جار ، وا بەرچاو دەکەوێ کە نەخۆش تەواو چاكبۆتەوە ، بەلام تووشهاتووەکەی دەپارێزێت‌و بەس . سەرەڕای نەخۆش‌دا پەیدادەبێت بەلام تەنیا لە ڤیرۆسە تووشهاتووەکەی دەپارێزێنەوەو بەسی . سەرەڕای ئەوەی کە زوربەی زۆری بالقەکان لەو ناوچانەی کە ئاووهەوا فێنکە بەرگەیان دژی ڤیرۆس (بی) لە لەش‌دا نییە .

ـ ڤیرۆس ـی زەرتك بەشێوەیەکی راستەوخۆ کار ناکاتە سەر جگەر بۆئەوەی شانەکانی بفەوتێنێت، بەلکو کاردەکاتە سەر هەندێ شانەی لەش ، وەك «کریفاوە »و لەپاشان وەکو ـ تەرمی سەیر ـ تەماشای شانەکانی جگەر دەکات . لە ،فەحسکردنی پزیشکی‌دا ، سێ بەلگە هەن ، تووشهاتن بە نەخۆشی زەرتك یان زەردویی دیاردەخەن . ئەوانیش :

ـ بوونی رادەیەکی زۆر لە مادەی «ترانسامیناز »و « بیلیرۆبین

دەبێ مادەی
پۆزیتیڤ بێت .

ڤیرۆسی (ئەی) لەرێگای چوونە دەرەوەی لەگەل پیسایی‌دا ، کە ئاوی خواردنەوەش پیس‌دەکات ، بلاودەبێتەوە . ڤیرۆس (بی) لەئاکامی بەردەوامی مانەوەیدا لە خوێن‌و شانە ئاوییەکاندا ، بلاودەبێتەوە. لەوەوە بۆمان دەردەکەوێت کەوا نەخۆش تەنیا بەرگەی ئەو ـ ڤیرۆس ـ ەی دەبێت کە تووشی هاتووە .

ترس لەم نەخۆشی‌یەدا پتردەبێت ، ئەگەر هاتوو حالەتی نەخۆش بەرەو خراپی بڕوات . جا لێرەدا پێویستە نەخۆش بۆ نەخۆشخانە ببردرێت. ترسەکە پترتر دەبێ ئەگەر هاتوو ڕێژگەی جگەر گیرا یان تووشی شێرپەنجە هات . بێ‌گومان ئەمەش وا لە نەخۆش دەکات کە بکەوێتە ژێر رەحمەتی نەشتەری پزیشك‌و عەمەلیات بکرێت .هەلبەتە ئەمەش ترسی زۆرە .

نەخۆشی زەردویی یان زەرتك ، زۆر کەم ڕێك‌دەکەوێ بەردەوام پاشماوەی لە جگەردا بمێنێتەوە هەرچۆن بێت (٩٥٪)ی پاشماوەی ئەم نەخۆشی‌یە ، دوای چاكبوونەوەی نەخۆش ، نامێنێتەوە .

**چارەسەرکردن‌و خۆپاراستن**

چارەسەرکردن‌و خۆپاراستن لە نەخۆشی زەردویی (زەرتك) ئاسانە . ئەبێ ئەم خالانەی خوارەوە رەچاو بکرێن :ـ

**ـ نەخواردنەوەی مەی .**

**ـ پشوودان‌و ماندوونەکردنی لەش .**

**ـ بەکارهێنانی چەند داوو دەرمانێك بۆ ئاسان‌کردنی کارەکانی هەرس‌کردن .**

**ـ نابێ نەخۆش خوێنی خۆی بە لەش ساخێك بدات .**

**ـ ئاگاداری پاك‌و خاوێنی ئاوی خواردنەوە بێت .**

**ـ بەکارهێنانی کەرەسەی پزیشکی (حوقنەی پلاستیکی) تەنیا بۆ یەك جار .**

**ـ حوقنەکردنی نەخۆش بە تەرمەکانی دژدار .**



# بەڕێوەبردنی کاتەکانی کارکردن هەروەك حیساب لە بانقدا بەڕێوە دەبرێ

**لە کارگەیەك یاخود لە بارەگایەکی دەستنیشان ـ کراوی کاردا ئەوەی مووچەخۆرێك لەکاتی ئیشەکەیدا بێزار دەکات ئەوەیە کە رەفتارێکی ئەوتۆی نەرمـی لەگەلدا ناکرێ کەچی لەگەل ئەوەشدا ئەو دەوامەیـدا کە دەیکات توتی بە توتی رەقی‌یەکدا دەتەقێتەوە کـە نەبوونی ئەم رەفتارە نەرمی‌یەو لوت تەقینەوەیە بەلوتی رەقیدا هەندێ جار نەگەل نـــەو پێداویستی‌یە کۆمەلایەتیانەدا ناگونجێ کە چەند کاتێکیان گـەرەکە بۆ جێبەجێ‌کردنو راپەڕاندنیان ، بەلام لەبەر ئەوەی کە ئەم جێبەجێ‌کردنو راپەڕاندنە ئەکەوێتە کاتـی دەوام‌کردنی ئەو مووچە خۆرەوەو ، ناکرێ دەوامەکەی جێ‌بهێلی نەبەرئەوە بۆی سەرناگرێ .. ئەمە بێجگـە لەوەی کە ئەم دۆخە نەك هەر نەگەل باری دەروونیو ئارەزووی مووچە خۆرەکەدا رێك ناکەوێ ، بگرە ئەم نەبوونی نەرمی‌و ئەو رەقی یەخە پێ‌گرتنە بۆ مەودایەکی کەم دەبێتە هۆی کەم بوونی بەرهەم ، خۆ ئەگەر هاتوو مەوداکە زۆری خایەن تێکەلو پێکە لیەکیش دێتـە کایـەوە .**

ئەم بێزاری‌یەش زۆرتر لای ئەو مووچەخۆرانە سەرهەلدەدات کە خواخوایانە لە چوارچێـــــوەی رژێمێکی نەرمی دەوامدا بن ئەگەرچی ئەو دەوامـەش چەند مەرجێکی پێوە بەسترابێتەوە ، خۆ ئەگـــەر هاتوو ئەم رژێمی نەرمی‌یەو نەبوونی رەقی‌یە سەربگرێ ئەوا لە نێوان دۆخی تایبەتیو کۆمەلایەتی کرێکارەکانو نێوان پلەی پێویستی بەرهەم لە کار کردنــــــدا! هەنگاوێکی فراوانو سەرکەوتوو ئەنرێ .

لەم رێ بۆچوونەوە کومپانیـــــا پیشەسازیو خزمەت گوزارە جۆربەجۆرەکانی ولاتە پیشەسازی ـ یەکانن سەبارەت بە دەوامی مووچەخوردکانیان رژێمی تایبەتی بەکار ئەهێنن ، ئیتر ئەو مووچەخۆرانـــەی کەوا لەو کومپانیایەدان کە پەیوە ندیان بە بناخـــــە بەرهەمی یەکانەوە هەیە و هەر وەك چۆن لەهەفتـــە یەکدا پابەندی پێشکەش کردنی چەند سەعاتێکن مافی ئەوەشیان هەیە کە لە چوارچێوەی سەعاتەکانـــــی دەوامەکانیاندا کەلك لە هاتوو چۆو گەڕان وەربگـرن بۆ جێبەجێ کردنی پێداویستەکانیان بەلام بەجۆرێکی ئەوتۆ کە ئەم کەلك وەرگرتنە زیان بـــە بەرهـــــەم نەگەیەنــــێ .

بۆ نموونە لەم کومپانیایەدا واتە کومپانیـــــــای ئەئمینی فەزەنسایی کە بە (هەروەزکـــــــــاری‌یە یەکگرتووەکان) ناسراوە ، لە کانوونی دووەمی ۱۹۷۹دا سیستەمی رەفتار نەرمی کردووە بە رێبازی خـۆی وەك ئەم شێوەیەی لای خوارەوە : ـ

لە کومپانیایەکدا کە ژمارەی مووچەخۆرەکانــی ۳۸۷ مووچە خۆرە لە شاری «ئەلبون»ی نزیك شاری «روان» کەوا پەیکەری «ژاندارك»ی لێ‌یـــــەو ۲۲۰ مووچە خۆریش لە پاریس کە ئەمە هەمووی‌دەکاتـــە (٦٠٧) مووچەخۆر لە «دوو بارەگای کاردا» کارەکانی خۆیان بە سەربەستی‌یەکی تەواوەوە بەسەر دەبەن ، وەك ئەو ئیشو کارە حیسابی‌یە تایبەتی‌یانەی خۆیان کە هەیانەو لە بانقەکاندا بەڕێوەی دەبەن ، ئەمەشـــ لە چوارچێوەی ئەو توانایەیاندا کە بۆ پاشـەکەوت ، یاخود بۆ وەرگرتنی پارە هەیانە .. جا پێشـەکی بێـت یان بەقـــەرز .

لەو رێ‌یەوە کە هەموو سەعاتەکانی کار لــــە هەفتەیەکدا .. کارێکی ساکارو بێ پشێوی رەسمی‌یەو دەوامی کاری تەواو لەکومپانیاکەدا بــــە (۳۸/۷٥)

سەعات دەستنیشان کراوە .. هەموو مووچەخۆرێك بۆی هەیەو چۆن دەیەوێ دە توانێ سەعاتەکانی خۆی زۆر بکات بە مەرجێ کە ژمارەی سەعاتەکانی لە هەفتەیەکدا لە (٤٨) سەعات تێپەر نەبێ .. هەروەها بۆشی هەیەو چۆنی بونی دەتوانی واش کەمی بکاتەوە بەلام نابێ ئەم کەمکردنەوەیە لە (٥ر٢٤) کەمتربێتەو ئەشێ لەو جیاوازی‌یەی کە هەیە لە رێك‌و پێکی پشوودانەکانیداو لە درێژە پێدانی ماوە بێ‌وچانەکانیدا کەڵك وەربگرێ .

لە بازنەی ئەم نەرمی‌یەدا ئەو مووچە خۆرە کە لە چەند هەفتەیەکی دەستنیشان کراودا بیەوێ سەعاتەکانی پشووی بە رێگەیێ سەعاتەکانی کارەکەیدا لە پلەی مام‌ناوەندیدا کۆبکاتەوە کە دەکاتە (٧٥ر٣٨) سەعات لە هەفتە یەکدا ، بۆی نیە کە ژمارەی سەعاتەکانی لە (٥ر٧٧) سەعات بەولاوە کەڵەکە بکات واتە بەرامبەر دە (١٠) رۆژ پشووی بێ وچانەو ناشبێت ژمارەی سەعاتی کەڵەك بووی لە (٧٥ر٣٨) سەعات کەمتری بدرێتێ‌کە دەکاتە پێنج (٥) رۆژ پشووی بێ‌وچان .

مەبەست لەم بەستنانەوەیە پارێزگاری ئەو پلە بنەرەتی‌یە یاخود ئەو پلەی پێویستەیە بۆ مانەوە لە نێوان پەیوەندی‌یەکانی کاروو بەرەو پێشەوە بردنی‌و کەم کردنەوەی تێکەڵ وپێکە لی‌و پەیداکردنی تەقە ـ لایەکی رێك‌و پێویست بۆ رێکخستنی نەهاتنی ئەو مووچە خۆرانەی کە هەفتەکەیان بە ساعاتی زیادە پر کردۆتەوە لە سەرجەمی مام ناوەندیدا ئەمەش بۆ نەڵك وەرگرتنە لەوانەی کەوا هەفتەکانی کاریان بەم سەعاتە زیادانە پر دەکەنەوە .

بەلام وەنەبێ ئەم بەستنەوانە مووچەخۆر بێ‌بەش بکات لەو پەیوەندی‌یەی کە لە نێوان حیسابە قەرزەکەی سەعاتەکانی کاریداو لە نێوان حیسابە قەرزدارەکەیدا هەیەو لەم پەیوەندی‌یەشدا ماوەی پازدە (١٥) رۆژ سەربەستی تەواوی گەران‌و هاتوو چۆی هەیە .

ئیتر کەوا ساڵ بەرەو تەواوبوون دەچێ مووچەخۆر بێ ئەوەی لەماوەی ئەوساڵەدا هەمووی هیچ پارەیەکی لێ ببرن، مافی سەعاتی سەربەستی کاری خۆی هەیەو ئەو مووچەخۆرە دەتوانێت ئەم سەعاتانە هەمووی دەستگیربکات .. واتە تیایانەدا پشوو بدات یاخود وەك سەعاتی زیادە کار لەسەریان پارە وەربگرێت ، بە مەرجێ کە ئەم سەعاتانە لە هەفتەك زیاتر نەبن .

بەلام بارە سەرنجیەکەی ئەوەیە کە مووچەخۆری کومپانیای تەئمینی ناوبراو بۆی هەیە کە لە ماوەی ساڵێکدا سێ مانگ پشوو وەربگرن‌و چاکەی ئەم سێ‌مانگ پشووەش بە سەعاتی زیادە کار ئەدەنەوە کە بە سەر هەفتەکانیاندا دابەش دەکرێ‌و پڕیەتی لە دەوام‌و بەرهەمی زیادە کار .

### ئەنجامی ئەم تاقی کردنەوەیە، تا ئێستا چی‌یە ؟

لە لێکۆڵینەوەیەکی بەرێز «پیر گارد»ی بەرێوەبەری بەشی خۆیەکی یاخود ئیش‌و کاری مووچەخۆرەکانی کومپانیای فەرەنسایی ناوبراودا وا هاتووە کە ئەم تاقی‌کردنەوەیە هیچ ئەنجامێکی خراپی نەبووە ، بەلام ئەو خراپی‌یەی کە وا خاوەن کارو کومپانیاکان لەم رێژەدا لێی بترسن ئەوەیە کە مووچە خۆرەکان پشوو دانەکانیان پڕ بە پێست بەکار بهێنن‌و .. واتە زیادە کارنەکەن‌و ، ئەم کارە شیان ببێتە هۆی ئەوەی کە تێکەڵ‌و پێکەڵی لە هەندێ کەرتی بەرهەم هێناندا پەیدا ببێت .

بەلام وەك دەر دەکەوێ تائێستا کومپانیاکەمەی ئەوش نەبووەو روون بۆتە وە کە مووچە خۆرەکان‌هەروەك چۆن باوە بە هۆشمە ندی‌یەوە کەڵك لەم سەربەستی‌و نەرمی‌یە لە کارەکانیاندا وەر دەگرن .

بۆ نموونە ، لە دوا .. مانگی ساڵی رابووردودا سەرەنجامی کەم بوونەوەو زۆربووی سەعاتەکانی کار بە گوێرەی بەشی زۆری مووچەخۆرەکان لە پێنج سەعات تێپەری نەکردو گەڵێکیان کەمی‌و زیادەی سەعاتەکانی کاریان لە مەش کەمتر بوودو هەشبوون هەر نەیانبووە.، ئەمە هەمووی بەرامبەر بە سێ مووچەخۆر بوون کە (٥ر٧٧) سەعاتی زیادەکاریان بووە ، لە کاتێکدا کە هیچ مووچەخۆرێك لە مووچە خۆرەکان سەرجەمی وەرگرتنی پێشەکی «سلفە» لە (٧٥ر٣٨) سەعاتی کار تێنەپەریوە .

لەو تێبینیانەی کە لە خوارەوەی تاقی‌کردنە وەکەدا دەرکەوتووە ئەو جیاوازی نەریتی‌یە کە لە نێوان پاریسێکان‌و نا پاریسێکاندا لە کومپانیاکەدا هەیە ، لە کاتێکدا نەوەکانی پایتەختی فەرەنسا وەك (سیسرك)ی پارچە شیعرەکەی شاعیری فەرەنسایی

# گوێچ و گوێی زانیاری له دەوڵەتی نورالدین محمود زەنگیدا

«٥٤١ - ٥٦٩ ی کۆچی»

(١)

بەشی یەکەم

نووسینی د. عماد الدین خلیل

معید ندیم کردوویە بە کوردی

«لافۆنتین» کە هەرگیز بیر لە زۆر کردن، پاشەکەوت کردن ناکەنەو لە حیسابی سەعاتەکانی کاریاندا تەقـە للای هیچ زیادی‌یەکیشیان نەداوە بەڵام نـــەوەی ناوچەکانی‌تر ، بەتایبەتی خەڵکی لادێکان خووەکەیـان وەك خوی «مێرووڵەی» پارچە هەڵبەستەکـــەی «لافۆنتین» وایە کە ژماردی بەرزیان لە پاشـەکەوت کردنی سەعاتدا نەك هەر دەستکەوتووە .. بکرە لـە پشوودانی زۆر درێژدا لە دیهاتەکانیاندا بەســەری دەبەن، کەڵکیان لێ وەردەگرن .

لە هەموو روویەکەوە جێ‌بەجێ کردنی ئــەم نەرمی‌یەو بەستنەوەی بۆ پاراستن بە دوو خاڵــەوە هەیـــە :

یەکەم : ـ پێویستی پاراستنی پلەی لە ســەدا دەستنیشان کراوی کاری هەموو بەرێوە بە رێتی‌یەکی بەرێوە بەرێتی‌یەکانی کارە .

دووەم : ـ بە رێوە بە رێتی لە پێشەوەو پێش کاتێکی دەستنیشان کراو ئاگادار بکرێ ، کە ئارەزووی کەڵك وەرگرتن لەو سەعاتە پاشەکەوت کراوانــە هەیە ، بە جۆرێك کە لە ماوەی ئاگادار کردنـــی پێشوو زووترین لە کاتێکدا کە پاشە کەوتەکانـــی سەبارەت بە کەڵك وەرگرتنە کە زۆرترین .

دوای نزیکەی ساڵ و نیوێك تاقی کردنـــەوە ، بەرێوەبەرایەتی کومپانیای ناوبراوو مووچەخۆرەکانی بەم کارە دڵخۆ شن‌و گیرو گرفتیــان نیـە ئـــەم دڵخۆشی‌و بێ گیرو گرفتی‌یەش هەر لـە سەرەتاوە چاوەروان کراو بوون هەروەها تاقی کردنی‌ەوەکەش تا چەند قوناغێکی دووروو درێژی نەبــری بـــلاو نەکرایەوە .. یەکەم جار ساڵی ١٩٧٥ بوو کە دەست کرد بە جێ‌بەجێ کردنی رژێمی نەرمی‌و تەنیا لـــە رۆژەکانی‌ی کارداو بەپێی ئارەزوو . بەڵام بەرێـــوە بەرایەتی‌یەکە تاوەکو بەڵێنی نووسینی لەســـەدا نەوەدی مووچە خۆرەکانی وەرنەگرت لەپێش هەموویا نەوە سەرۆکی نیقابەکان ئەم تاقی کردنەوە یەی بلاو نەکـــردەوە .

له وڵاتی شام‌و جزیره‌دا ده‌وڵه‌تی (نورالدین محمود كوڕی عیمادالدین)ی زه‌نگی (٥٤١ ـ ٥٦٩)ی كۆچی گورج‌وگۆڵی‌یه‌كی زانیارانه‌ی گه‌لێ به‌ربڵاوی به‌خۆیه‌وه دیوه به‌جۆرێك له‌ هه‌موو شوێنێك خوێندنگه‌و ده‌زگای زانیاری بووه ، له‌ رۆژهه‌ڵات‌و رۆژئاواوه زاناو نووسه‌ران روویان تێ‌كردو باری دارایی‌و كۆمه‌ڵایه‌تی بۆ پیرانی زانیاری‌و خوێندكاره‌كانی مسۆگه‌ر كردبوو ، كۆڕو كۆمه‌ڵی پێك‌ئه‌هێنا بۆ لێكۆڵینه‌وه‌ی هه‌موو جۆره كارو مه‌به‌ستێك كه په‌یوه‌ندییان به لقه‌كانی زانیاری‌و رووداوی جۆربه‌جۆره‌وه هه‌بوایه ، له رۆژهه‌ڵات‌و له رۆژئاواوه زانایان نزیك‌بوونه‌وه‌وه هاتن‌و پێشكه‌وتن‌و له‌به‌رده‌میانا هه‌موو رێگه‌یه‌كی كرده‌وه ، بوونه چینی یه‌كه‌م‌و به‌رزترین پله‌یان وه‌رگرت .

نورالدین محمود زۆر چاك سروشتی ئه‌و سه‌رده‌مه‌ی خۆی ده‌زانی كه بووبووه سه‌ركرده‌ی سه‌ركردایه‌تی‌یه‌كی مه‌ترسی‌داری و له به‌رده‌م یه‌كێ له كه‌له‌به‌ره‌كانی پێشه‌وه‌ی‌دا راوه‌ستابوو به‌رامبه‌ر دوژمنێكی بیروباوه‌ڕ كه چووبووه ئه‌و زه‌وی‌یه‌وه‌و ره‌گی نیو سه‌ده‌یه‌ك زیاتر داكوتابوو كه نورالدین له‌سه‌ری وه‌ستابوو .. به‌ڵێ ئه‌یزانی كه ئازادكردنی زه‌وی‌و یه‌كخستنی نه‌ك هه‌ر كارێكی رامیاری‌و سوپایی‌یه بگره له‌وه زۆر فراوانتره .. ئه‌وه به‌ره‌و روو‌بوونه‌وه‌ی شارستانی‌یه‌ته له‌نێوان نه‌ته‌وه‌یه‌ك و نه‌ته‌وه‌یه‌كی تردا ، به‌بێ ره‌سه‌نایه‌تی خودی شارستانیه‌ت بۆ نه‌ته‌وه‌ی شه‌ڕكه‌ر ، سه‌ركه‌وتنه‌كانی به‌سه‌ر دوژمن‌دا بریتی ئه‌بێ له كاری بچووك‌و دیاری‌كراو ، هه‌موو كاتێ تووشی به‌رزو نزمی‌و گۆڕان ئه‌بێت هه‌روه‌ك هه‌موو جارێ رووده‌دات .

ئه‌و هه‌ڵوێسته مێژوویی‌یه كه پێویسته .. ته‌نیا سه‌ركه‌وتنی ده‌ره‌وه‌و گه‌ڕانه‌وه‌ی قه‌ڵایه‌ك نیه ، به‌ڵكو بنیات‌نانی نه‌ته‌وه‌یه‌كی شه‌ڕكه‌ری ئه‌وتۆیه كه ئه‌زانێ چۆن بوونی خۆی ئه‌پارێزێ‌و پارێزگاری هه‌ڵكه‌وتوویی شارستانی ده‌كات له شێتاڵ بوون‌و نه‌مان .. ئه‌و كاته هه‌موو سه‌ركه‌وتنێكی سوپایی یاخود ده‌ستكه‌وتێكی رامیاری بۆ ته‌واوكردنی بناغه‌كه ، هێزی ره‌سه‌نایه‌تی‌و ده‌ست‌به‌ردار نه‌بوونی به كۆمه‌ڵی شه‌ڕكه‌ر ده‌دا ، نه‌ك هه‌ر بۆ لێدانێك‌و دوو لێدان خۆی ئه‌چه‌سپێنێ . به‌ڵام له سێیه‌م‌و چواره‌م‌دا ده‌ڕوخێ‌و له‌گه‌ڵ روخاندنیشیا ته‌قه‌ڵلاو جواناوو خوێنی درێژایی ساڵان به فیڕۆ ده‌ڕۆن

چالاكی‌و پێشكه‌وتنی زانیاری له سه‌رده‌می نورالدین محمودا ته‌نیا بۆ رابواردن نه‌بوو ، هه‌روه‌ها ئه‌ته‌كێت‌و لاسایی‌كردنه‌وه‌یه‌كی ده‌وڵه‌تیش نه‌بوو ، به‌ڵكو نه‌خشه‌یه‌ك بوو ئامانجی كاری ره‌سه‌نایه‌تی كردنی شارستانیه‌ت بوو له‌ڕێی گورج‌وگۆڵی رۆشنبیری‌و په‌روه‌رده‌یی‌یه‌كی به‌ربڵاوه‌وه ، كه به‌هۆیه‌وه بیر به ره‌وشت‌و زانیاری‌و كاره‌وه ده‌به‌سترێ ، دیواری جیاكردنه‌وه‌و دووڕوویی ئه‌رووخێ‌و دووقۆڵی‌یه‌كان نامێنن‌و مرۆڤی به‌سه‌نگ‌و كۆمه‌ڵی خاوه‌ن باوه‌ڕ دێنه مێژووه‌وه .

نورالدین خۆی زاناو ده‌سه‌ڵاتدار بووه ! ئه‌مه‌ش خاڵی ده‌ست‌پێ‌كردن‌و به‌ردی بنه‌ڕه‌ته ..

هه‌روه‌ها بیروباوه‌ڕی (ابی حنیفه )ی ده‌زانی‌و بێ خۆ پێوه هه‌ڵكێشان‌و له‌ڕێ لادان له‌سه‌ری ده‌ڕۆی ، مێژوونووسه‌كان هه‌موو هاتوونه‌ته سه‌ر ئه‌وه‌ی كه بیروباوه‌ڕ به‌لایه‌وه هه‌موو یه‌كن‌و ویژدان له هه‌موو شتێكدا ره‌وشتی بووه .

گوێی له وتووێژه ئاینی‌یه‌كان ده‌گرت تاوه‌كو رێ‌دانی زانیاری پێ‌درا كه به‌مه‌ش ئه‌و بواره‌ی ده‌بێ كه ئه‌ویش بۆ خه‌ڵكی تری بگێڕێته‌وه ، له‌گه‌ڵ زۆری كاره رامیاری‌و سوپایی‌یه‌كانی‌دا وته‌ی ئاینی به‌كارهێناو ، ته‌قه‌للایه‌كی بۆ پته‌وكردنی پایه‌ی ئاین‌و بڵاوكردنه‌وه‌ی به پارێزگاری‌و به‌جێ‌هێنان‌و گفتوگۆكردنه‌وه‌دا ، ئه‌م كاره‌ش یادی ته‌قه‌ڵلای خه‌لیفه‌ی ئه‌مه‌وی (عمری كوڕی عبد العزیز ) مان له‌م رێڕه‌وه مه‌ترسی‌داره‌دا پێ‌ئه‌كاته‌وه . هه‌روه‌ها نووسراوێكی له خه‌باتی ئاینی‌دا «جهاد» پێكهێنا (٣) زۆر نووسراوی كرده وه‌قفی خوێندنگه‌كانی ، به‌خت باشی ئه‌وه‌بوو كه زۆر نووسینی فه‌قێیایه‌تی ده‌خوێنده‌وه‌و خاوه‌ن هۆشێكی پته‌وو باوه‌ڕی ووردو سه‌نگین بوو .

ئه‌م پیاوه كه له پۆپه‌ی ده‌سه‌ڵاتدارێتی‌دا بوو له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌وه‌نده شه‌یدای زانیاری بووبوو ته‌قه‌للای ده‌دا (به زاناو چاكان بێ‌و رێڕه‌وی ئه‌وانه‌شی ده‌گرت كه‌وا پێش ئه‌وان به باشی ناویان بووه‌و ئه‌وانه‌شی كه‌وا سه‌ر به‌وان ، بۆ پاراستنی ژیانیان (٥) ، زانا به‌لایه‌وه پله‌ی هه‌ره‌پێشه‌وه‌و شوێنی گه‌وره‌ی بووه‌و (٦) ، ئه‌یهێنانه كۆڕه‌كه‌ی خۆیه‌وه‌و ده‌ستی ئه‌گرتن‌و له‌گه‌ڵیانا ساكار بوو ،

ئەگەر یەكێكیان بهاتایە بۆ لای هەر چاوپێكەوتنی لەبەری هەلدەستاو باوەشی پیا ئەكردو لەسەر بەرەكەی خۆی لەتەنیشت خۆیەوە دایدەناو بە راسترەوی خۆیەوە هەروەك ئەمە كەسێكی زۆر نزیكی بێ وا بە چاوی رێزو سەنگینیو بابەوخەوە لەگەلیا دەدوا (۷) ..

كۆرەكەی كۆمەلگەیەكی گەورە بوو كە زاناو فەقێیەكان بۆ وتەی ئاینیو دەربڕینی سەرنج تێیدا كۆدەبوونەوە ، سەرنج دانەكەشی گۆرجوگۆلییەكی راستیانە بوو بۆ بەرەوپیرچوونی گیروگرفتو تاقیكردنەوە نویێو گۆڕاوەكان ؛ بەو چارەسەركردنەوە كە لە یاسای موسولمانێتیو فەقێتییە بلاوو گەورەكەیەوە چنگی دەكەون .. لەبەر ئەودی پیاوەكە دەیەوێ زاخاوی ژیان ؛ لە هەموو روویەكییەوەو بە درێژاییو پانتایی بداتەوە بەجۆرێ كە لەگەل بیروباوەڕی موسولمانێتیو سەرنجەوە بۆ شوێنی مرۆڤ لە جیهاندا بگونجێ .. لەبەر ئەوە ئا ئەم كۆڕانە كە لە كۆڕ یاخود كۆڕە پەرلەمانیەكان دەچوون كە تایبەت بوونو ماودیەك بۆ ماودیەكی تر كۆدەبێتەوە بۆ چارەسەركردنی گیروگرفتێ یان دەركردن یاخود دانان بە یاسایەكدا ؛ ئێمە لێرەدا یادی ئەو كۆبوونەوە فراوانە دەكەینەوە كە نورالدین لەگەل كۆمەلێ زانادا كردی ئەوانەی كە هەلبژێردرابوون بۆئەودی نوێنەرایەتی هەموو بیروباوەڕێكی فەقیەتی بكەن بۆ پیاچوونەودی ژمارەیەك مەسەلەی وەقفو قازانجی گشتی (۹) ، ئەتوانین لێرەدا دەست بۆ ئەوە بكێشین ـ هەروەها ـ بۆ گێڕانەودی ابن‌الاثیر كە كۆڕەكەی وەك كۆڕەكەی پێغەمبەری خودا درووودی خودای لێ بێ «كۆڕی لەسەرخۆییو شەرمو شكۆ بوو هیچ نابەجێییەكی تیا نەبوو . كە لە زانینو ئاینو باری چاكانو راوێژ سەبارەت بە كاری خەباتی ئاینیو تەقەلاو چوونە ولاتی دوژمنەوە نەبێ هیچی تری تیا نەتراوە (۱۰) هەروەها ئەو گێڕانەوەشی كە سەبارەت بە نورالدین دەلێ كە هەلساوە بە ئامادەكردنی ژمارەیەك فەقێو پرسی پێ كردوون سەبارەت بەودی بۆ وەقف چەندی بەردەكەوێ لەو سامانو داراییو مایەیەی كە هەیەتی بۆ قازانجی موسلمان) .

( ئەودی وتیان هەر لەوێدا هەلگیرا . هەروەك چۆن لەگەل خەلكی تردا كردیان (۱۱) . ئەودی كە لەلایەن نوێنەرانی یاسای نرخدارەوە دەردەچێ دەبێ هەموو مرۆڤێ ئایا لە پۆپەدا بێ یاخود لە بنار دەستی پێوە بگرێو لێی لانەدات ، هەروەها وتەیان وتەی سەرەتاو كۆتاییە ئەمەش لەبەر ئەودی كە نورالدین هەروەك زانیمان كە تا چ رادەیەك لەگەل خودای خۆیداو لەگەل خۆیو جەماوەری نەتەوەكەیدا راستكۆ بوو .

زاناو یاسای ئاین بەرێوەبەردكان لە دەولەتی نورالدیندا گەیشتنە پلەیەك وایان لە میرەكان كرد كە لە پۆپەوە بێنە خوارێ بۆئەودی ئەوان بچنە جێگەیان ، میرەكان حەسوودیان بە پلەكانیان دەبرد ( لای ئەو ئەكەوتنە چالەوەو كۆتاییان بێ دەهێنان ، ئەگەر بهاتایە لە مرۆڤێكەوە خەوشێكیان بگواستایەوە ئەلێ : « كێ بێ‌تاوانە ؟ بەلام تەواو ئەودیە كە بە تاوانەكانیدا بچێتەوە » (۱۲) .

ـ ابن الاثیر دەلێ : پێی وتم كە هەندێ لە میرەكان حەسودی بە قطب‌الدین نیسابوری فەقێی شافعی دەبەن كە لە خوراسانەوە هاتبوو زۆر رێزو یارمەتی پێ بەخشیبوو .

یەكێ لەمانە هاتە لای نورالدینو وتی : تۆ ئەگەر ئەودی ئەیلێیت راستە كە ئەمە ئەوەندە چاكەی هەیە هەرچی تاوانێك كە باسی دەكەیت هەمووی دەشواتەوە كە ئەویش زانیاریو ئاینەو تۆو هاورێكانیشت دوو ئەوەندەتان هەیەو چاكەی واشتان نیە كە تاوانەكانتان بشواتەوە ، نورالدین وتی : تۆ هەرچی خەوشێكت هەیە خۆت نایزانی ، خەلكی تر دەیزانێ ، من لەگەل نەبوونی چاكەتاندا خراپەشتان بەرگە دەگرمو بەلام بەرگەی خراپەی وا ناگرم ـ ئەگەر ئەمە لەگەل بوونی چاكەكەشیدا راست بوو ؟ ئەوا من بڕوات پێ ناكەم كەوا دەلێی ئەگەر ناوی بێنی یان ناوی یەكێكی تر جارێكی تر بێنی ئازارت دەدەم ، لێی گەڕێ (۱۳) .

هەرۆەك دەلێن پیاوەكە لەگەل زاناكاندا بەشێودی دەستە كاری نەكردووە ، بكرە فەقێیەكی لەژێر پەردەی زانیاریدا تێكەل بە نەزانێك كردووە، باشی لە خرپدا بزركردووە .. گەلێ جار لەنێوان زاناكاندا پیاوێك یان دووان ، سواری ئەو پلەیەیان دەبن كە پێی گەیشتوونو لەو بەرگەدا خۆیان مەلاس دەدەن كە لەبەریان دایە بۆئەودی راستی نەلێین ، یاخود پووچ بە راست دەگۆڕنەوە ، یاخود بە ئایەتەكانی خودا نرخێكی كەم دەدەن .. پیاوەكە

درۆی نەدەویست ـ ( درۆ بەرامبەر خوداو خەڵك‌و ڕاستی ) بە کورتی‌یەکەی ناپاکی‌و فرت‌و فێڵ‌و توانج‌و پلارو درۆی هەرگیز نەدەویست ، لەلایەکی ترەوە چالاك بوو سەرنجی وردو خێرایی‌یەکی ڕەوانی هەبوو کە بە جۆرێك بزانێ سەنگی ئەو کەسانە چەندە کەوا بە وردی‌یەکی سەرسوڕهێنەردوە (وەك سەرنجی ئەوانەی کە دەکێشن ) کاری لەگەڵدا دەکردن ، ئەو پیاوە هەروەك (عمری کوڕی خطـاب ) خوای لێ ڕازی‌بێ بەخۆی ئەگوت نە ساختە دەکەم‌و نە ئەیەڵم کەسیش ساختەم لێ بکات .. وایە هەروەها وا دیارە هیچ پیاوێك نەیتوانیوە ئەم ڕاستیانەو چالاکی هەڵسەنگاندنی خەڵکی نورالدین دەرببڕێ . جا با ئەو کەسە لە هەزار بەرگی زانینەوە خۆی بپێچێ‌و لەپشت هەزار پەردەوە خۆی بشارێتەوە .. ئەوەی کە لە سەردەمی ئەودا ژیاوەو بۆمان دەگێڕێتەوە : (عماد الاصفهانی ) یە کە زانیاری ئەو پیاوەو ئەفسانەی بە مێشکیا نەچوویان بۆ دەردەبڕێ بێجگە لە خەڵك ناسینی « لە رجبدا ـ دەڵێ ـ نورالدین خوێندتگەیەکی پێ ڕاسپاردم‌و لە ئەوقاف پارمەتیەکی زۆری خۆم‌و خوێندنی داین ، یەکێ لەو فەقێ‌یانەی کە تێیدا بوون ابا البرکات خضری کوڕی شبل‌ی دیمەشقی بوو،کە ساڵی ٥٦٢ ی کۆچی مردوو دوو کوڕی لەپاش بەجێماو ئەو دوو کوڕەش هەروەکو باوکیان ڕێی فەقێ‌یەتیان گرت بەڵام دوایی پیاوێکی مەغربی دڵخۆشی دانەوە بەکاری کیمیاگەری (١٥) هەڵی خەڵەتاندن‌و تواندی‌یەوەو دەری‌خستن ، ئەم کارە ڕقی نورالدین هەڵساندو هەردووکیانی بانگ‌کردو هەموو جۆرێك هونەری ئاگادارکردنەوەی لەگەڵا بەکارهێنان بەڵام لە هیچیان وەڵامێکی چاکی وەرنەگرت‌و پێی وتم : مەسەلەکە تۆ وەری‌بگرەو منیش وەك مامۆستا یان چاودێری‌کەرێك دابنێ (١٦) .

**(٢)**

لەگەڵ ئەم باوەش کردنەوەیە بۆ زانا چاکەکان‌و ئەم نزیك‌کردنەوەیان‌و لێ نزیك بوونەوەیان ، بەرامبەر ئەو پێخۆشبوونەی کە زانیاری ئەیبەخشێ و ئەوەی مێشك وەبەری دەدات ، نورالدین ـ هەروەك زۆر لە مێژوونووسان ئەیڵێین (زۆر بە شیعر دڵخۆش نەبووە(١٧) ئەمەش نەك لەبەر ئەوەی ڕقی لە شیعر بووەو یان لەگەڵ بەخشینە ویژدانی‌کەی‌دا ڕێك ناکەوێ کەوا هەست‌و دڵی ئەلەرێنێتەوە ، بگرە لەبەر ئەوەی شاعیرەکان خۆیانی نەویستووە ، نورالدین هەروەك ناسیمان ، ڕقی لە درۆو ساختەو زۆرداری‌و دەست‌بڵاوی بووە .. شوێن ئاینێکی چاك بووە کە ئاین بێ ئەو نابێ .. لە درۆ ڕق بوونەوەو نەویستی زۆرداری ، تەقەلای بێ‌وچان، لە بەرامبەری‌دا ـ بۆ چاودێری کردنی پۆپەکانی ڕەواو دادپەروەری لێرەدا (عمری کوڕی عبدالعزیز) مان بیردەخاتەوە ، نەك ڕق‌بوونەوەی لە تاقی‌کردنەوەی شیعری‌دا ، بگرە بە دەست‌کردنی خۆ هەڵواسین‌و لاوازی‌و شیعر فرۆشتنی شاعیرەکانی ئەو سەردەمە .

( ابن عساکر ) شایەتێکی تری ئەو سەردەمەیە، بە وشەی چەسپاو پێمان دەڵێ کە بۆچی نورالدین زۆر خۆشی بە شیعر نەهاتووە . بە شیعری ناوناباو بگرە بە ستایشی لەقەڵەم ددات ، لەبەر ئەمە لەم بوارەدا نیشانەکەی گاڵتەیە کە شاعیرەکان زۆر بووبن خۆشی نەهاتووە ! ئەمەش شێوەی (عمری کوڕی عبدالعزیز) بووە(١٨) .

نورالدین وەك ئەوانی پێش ئەو دەرگای بە ڕوودا نەکردوونەوە ، هیچی نەدەدانێ ! سەبارەت نورالدین لە بەغدا لە (یحیای کوڕی محمد الوهران) یان پرسی لە یەکێ لە مەقاماتەکانی‌دا وتی (ئەو ڕمی بە جەوهەری دەوڵەتەو ، گۆشەیەکی بەهێزی خەلافەتەو میرێکی لە خودا ترسەو شایەکی تێکۆشەرە ... بەڵام ئەو کە ناسراوە بەجێی حەوانەوەی ڕێبوارو پشووگەی بەکەڵکی شاعیرو ئەدیب ، کەچی شاعیر فەرێکی ئەوتۆی لێ دەست نەدەکەوت(١٩) . واتە (بەڵام ئەو کە ...) کە هەندێکی دەربڕینی ستایشی وتووە ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ ئەم هەڵوێستەی بەلای هەموانەوە باش نەبووە .. هەمیشە ئەوانە کە هەن لەسەر حیسابی هەر شتێك بێ وەرگرن ئەمەش لە سەردەمێکدا کە گوێی ئەوانە بەوە قانگ‌دراوە (هەزار دینـاری بدەنێ ...) یاخود بەوەی (چیت دەوێ بڵێ ) !

لەو شاعیرانە (اسامەی کوڕی منقذ)ە کە بەم چوار دێڕەی خوارەوە ستایشی نورالدین دەکات :

**سلطاننا زاهد والناس قد زهدت**
**له فضل علـى الخيرات منكمش**

**ایامـه مثـل الصـوم طـاهـره**
**من المعاصی وفیها الجوع والعطش**

بەڵام (ابا شامه) مێژوونووسی دیمەشقی خۆی بەرامبەر ئەم دوانە رادەوەستێ‌و وەڵامیان دەداتەوە کە خاوەن مەقام‌و خاوەن شیعرەکەن‌و (لەبەر دووری ــ ووبی کە زۆر شاعیر بوویانەو) بۆ روونکردنـــەوەی هەڵوێستە مەزنەکە دەڵێ (نورالدین دارایـــــــی موسوڵمانەکانی هەر بۆ رێی ئاین‌و خەباتی ئاینـــی خەرج‌کردووەو کەڵکی بۆ خودا پەرستەکان نابـــێ) هەروەك عبداللەی کوڕی محیریز کە خۆی لە ساداتی شامە ــ وەکو ئەویش بە نورالدین دەڵێ :

هەروەك خوای خۆش ویستووە ئەوەندەشـــ

بەخشندە بووە ، چاو چنۆك بووە وەك بتانـــەوێ !

بەڵام شیعرەکەی (کوڕی منقذ) جێی بایەخ نی‌یە کـــە

لە شەوی زاین‌دا ستایشی نورالدین پێ دەکات :

**فی کـــل عـــام للبریـــه لیلـــه**
**فیهـا تشـــب النـــار بالایقاد**
**لکن لنورالدیـــن من دون الوری**
**ناران : نار قری‌ونار جهاد..هتد**

کوڕی منیرو کوڕی قیـرانی‌و عمادو هی تر لە ستایشی نورالدین‌دا شیعریان وتووە کـــــــە باش‌و چێژدار بوون‌و وەڵامی وهرانی کــوڕی منقذیـــــــان داوەتەوە ... بگرە شاعیرو خەڵك ــ هەروەك خوادی گەورە لە ستایشی نەتەوەکەدا دەڵێ (فان اعطـــــو منها رضوا وان لم‌یعطوا منها اذا هم یســـخطون(٢٠) وما کل وقت ینفع العطاء(٢١) ) .

ئەم دوو پیاوە عمرو نورالدین وەنەبێ شیعریان ڕق لێ‌بێ کە شێوازێکی هونەری‌یە لە دەربڕینـــدا .. تاقی کردنەوەی (عمری کوڕی عبدالعزیز) لە ناسکی‌و تەنکی‌دا گەیشتبووە رادەیەك نەك هەر بکاتــــــــە ویژدانی‌یەتی شیعر بگرە زۆر لەوەش بە ماوەیەکـــی زۆر تێپەڕی کردووە ، خۆی لە منداڵی‌دا شـــیعری وتووەو ئاوازی بۆ دادەنا ، پیاوێك ئاوابێ رەنگ نیـــە رۆژێ لە رۆژان دوژمنایەتی شیعر بکات .. هەروەها

نورالدین هاوەسەردەمەکانی کە بۆمان دەگێڕنـــەوە کە لە هەڵوێست‌و بۆنەدا ویستوویەتی گوێی لـــــە شیعر بێت ! عماد دەڵێ : نورالدین لێی‌پرسیم کـــە (مثنویات)ی شیعری بۆ رێی تێکۆشانی ئاینی بڵێـــم ، وتـــم :

**للغـزو نشـــاطی والیـــه طربی**
**مالی فی العیـش غیره مـن ارب**
**بالجـــد والجهـاد نجـح الطلب**
**والراحه مستودعه فی التعـــب**
**لا راحــه فی العیش سوی ان اغزو**
**ســیفیا طربـا الی العالی یهتـز**
**فی دل دوی الکفـر یکون العـز**
**والقـدره من غیـر الجهاد عجز**
**اقسمت سوی الجهاد مالی ارب**
**والراحــه فی ســواه عندی تعب**
**الا بالجـــــد لا ینـــال الطلب**
**والعیش بلا جـد جهاد لعب(٢٢)**

لە شوێنێکی تردا دەڵێ : جارێك بەســــواری لەگەڵ نورالدین‌دا لە یەکێك لە گەڕانەکانی‌دا لـــــە طبریە دژی خاچەکان لێی‌پرسیم ، چۆن ئەوەی رووی‌دا لێی دەدوێی ؟ بەم شێوەیە ستایشم‌کرد :

**عقـدت بنصـرك رایـه الایمـان**
**وبنت لعصرك ایه الاحسان..هتد(٢٣)**

ئەبێ نیشانە لەمە زیاتر چی بێ کـــــە شاعیرە گەورەکان پەیوەندیان بە سەردەمی نورالدین‌ەوە هەبێ کە لە سەرو هەموویانەوە کوڕی قیـرانی‌و عمـادو اصفهانی‌و(٢٤) کوڕی منیرو(٢٥) کوڕی دهانـــــــی موصلی‌ن(٢٦) ، ئەمانەی کە لە دەوڵەتی نورالدین‌دا زەمینەیەکی چاکیان بۆ گەشەکردنی شیعر دۆزی‌یەوە کە لە زۆر دەرگای فراوانیاندا بەرەو ئاسۆی یەکجار دوور رۆیشتن کە بە شیعرە نابابەکانیان نەیـــــان دەتوانی بیگەنێ ئەگەر لەو پیاوەوە پێ خۆش‌بـــوون‌و سەرکەوتن‌و گونجانیان دەست نەکەوتبێ .

.. لەبەر ئەوەی کە لە مەسەلەکە نەچینـــــە دەرەوە لێرەدا نامانەوێ دەربارەی ئەو شـــاعیرانە هیچ بڵێین‌و ئەوە لەسەرمانە ئەوەیە کە خوێنـــدەوار رەوانەی دیوانی شاعیرەکان خۆیان‌و نووســـراوی (الخریدە) ی اصفهانی(٢٧) هەردوو دەوڵەتـەکـــەی کوڕی شامە بکەین ، بۆئەوەی نابابی بە چاوی خۆیان ببینـــن(٢٨) .

عبد الرقیب یوسف

# پزیشکی کوردەواری

بەشی چوارەم



## پورە حەبسە ...
## پزیشکی ژنان

پورە حەبسە (حفصە) عەزیزی فەلکی شاری سلێمانی ، یەکێکە لە پزیشکە میللی‌یە شارەزاو ناودارەکانی گەلی کوردمان ... پسبۆری نەخۆسە ئافرەتانە .. وەکو نەخۆشی منداڵدان‌و بێ‌نوێژن‌بوون‌و جۆرەها کاری نشتەرسازی‌ی منداڵ نەبوون‌و .. هتاد ..

پورە مەبسە ، پزیشکە میللی‌یەکی سەرکەوتووە لە کارەکانیدا ... بەردەوام ئافردت ، بۆ جۆرەها نەخۆشی ، دەچنە لای .. زۆر سوریان لێ وەرگرکووە ..

پورە ، کە تا ئێستا (٨٠ ـ هەشتا) بەهاری بەسەبردووەو لەم پیشەیەیدا بەردەوامە لە ئامینەی دایکی فێربووە ، کە ئەویش لە دایکی (فاتمە مارف ـ واتە نەنکی حەبسە ـ ) فێربووە .. پوریشی (عاصمە رەیحان) پزیشکی‌ی میللی بووە لە شاری سلێمانی .

چونکە ئیشی پورە حەبسە تایبەتە بە ژنان‌و نەخۆشیەکانیان .. تا رادەیەك ـ شارەزابوون‌و زانینی چۆنیەتی بەکارهێنانی جۆرەها دەرمان‌و گرتنەوەیان‌و .. چین‌و چۆنن بەنسیەت پیاوەوە ـ زۆر ـ ئاشکرا نیە . وە بۆ ـ مەبەستێك ـ نەبێ پیاو ناتوانێ بەسەریان بکاتەوە تێیان بگات .

من لەم بارەیەوە تووشی هیچ تەگەرە نەهاتم . چونکە هەر لە زستانی ١٩٦٢ دەمناسی‌و ناسیاویشم لەگەل (مام عەلی محمد امین)ی میری ، بەهۆی کورەکەیەوە (مامۆستا ـ احمد) پەیداکردووە دەمێکیش بوو بیری وەرگرتنی هەندێ زانیاری ئەم بابەتە لە پورە حەبسەدا لە مێشکما پەنگی خواردبووەوەو بە خۆزگەی لێکۆلینەوەو لەسەر نووسنیيان بووم ..

ئەم ویستەم لە هاوینی پێرار بۆ هاتەدی . ئەوەبوو توانیم لە ژوورە قوڕاوییەکەی پورە حەبسە بچمە ژوورەوەو لەگەل خۆی‌و مام عەلی (کە جاربەجار وازی لە کەوەکانی ئەهێنا ، چونکە کەوبازێکی بەخووە ، وە هەندێ نەخۆشی باشتر بۆ شەرح دەکردم) !

درێژترین‌و بەچێژترین دانیشتن بکەم .. ئۆخەی .. ئەو خەونەم هاتەدی .. ئەبێ وەلامی گشت پرسیارەکانم بدرێتەوە .. !

### دەرمانەکانی منداڵبوون

پورە حەبسە ، بۆ منداڵبوون ، ئەم هەشت شتانەی خوارەوە لەگەل یەك تێکەلاو دەکات‌و باش دەیانکوتێ تا دەبێتە شلە . ئەوسا بەو ژنەی دەدات کە منالی بۆ نابێ . ئەمانیش :

**١ ـ زەعفەران (زعفران)ی ئەسلی .**
**٢ ـ قورسی کەمەر : ئەنێ شتێکە لە کوردستان نیە .**
**٣ ـ نەباتی میسر (مصر) : وەکو نیدروندروزی وایە ،**

**بەلام شیریتە ... جۆری سپی ، کە لە دوکانە کۆنەو عەتارەکانی بەغدا دەکڕێ .. بەکاردێنێ .**

**٤ ـ نەعنایە خڕدی نەسلی .**

**٥ ـ جەوز : شتێکە ، دوای ئەوە ئەشکێنرێ ناوکەکەی بۆ تێکەڵکردنەوەی ئەم دەرمانە بەسوودە.**

**٦ ـ توی خورما یانی (طلع) ، کە لە بەهاراندا لەسەر تۆپکە سەری دار خورماوە دەردەچێ (وەی دارە نێرەکە بۆ دارخورما مێیەکە ئەیەنو لێی ئەدەن بۆ ئەوەی بەربگرێو خورمای پێوە بێت) .**

**٧ ـ هێل**

**٨ ـ هەنگوین .**

با ئەم هەشت شتانە ، دوای هاڕینیانو بوون بە شلە ، لای خۆی هەڵدەگرێو کاتی پێویست دەری دێنێ ..

پورە حەبسە لەم دەرمانەی پیشان دام .

**دەرمانێکی تر :**

پورە حەبسە ، دەرمانێکی تریش بۆ هەمات مەبەست بەکاردێنێت ، ئەمەیە :

ڕەگی گیای بنەبەڵەك ، کە لە کوردوستاندا زۆرە ، ووشك دەکاتو ئەوجا باش دەیکولێنێ تا ئاوەکەی خەست دەبێ .. ئەو ئاوە خەست بووەش بەم جۆرەی خوارەوە بەکاردێنێ :

شەش ڕۆژ لەسەر یەك ، هەر ڕۆژێ یەك پەرداغ ئەدات بەو ژنەی کە منالی نابێ .. وە ئەبێ ژنەکە لەم ماوەیەدا لە (عوزر ـ بێنوێژ)ی.

**دەرمانەکانی پورە حەبسەو ...**
**پزیشکیی کۆن .**

گەر بێت چاوێك بە سەرچاوە پزیشکییە کۆنەکان بخشێنین ، ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە کە هەندێك لەو شتانەی کە پورە حەبسە بۆ دەرمانی منال نەروون (جۆری یەکەم) بەکاری دەهێنا .. بۆ نەخۆشیەکانی منالدان سوودبەخشن . بێگومان منال نەبوون ئەگەڕێتەوە سەر بوونی هەندێ نەخۆشی منالدان .. جا بەکارهێنانی ئەم دەرمانانە ڕەنگە نەخۆستەکە لابەرێتو چاکی بکاتەوەو ، ئەوسا منالی ببێت .

ڕازی ، کە یەکێکە لە هەرە بەرزترین دوو پزیشکی سەردەمی ئیسلام (ئەوی تریان ـ ابن سینا ـ یە) ، هەنگوین بە دەرمانی (منداڵدان) دادەنێ . وە سەبارەت بە منال نەبوونەوە ئەڵێ : (اذا كان السبب من الشحم يقطع عرقها ثم حملها (اى الرحم) فرزجه من عسل ودهن سوسن ..).

هەروەها ڕازی ئەڵێ ، کە هەنگوین بۆ ئاوساوی منالدان . وە تێکەڵکردنی لەگەل زەعفەرانو ڕۆنو تری یان مێووژ بۆ نەخۆشی «القروح الخبيثه في الرحم» سووربەخشە .

هەروەها هەنگوین بە دەرمانێکی باش دادەنێ بۆ منالدان دوای نشتەرسازیی دەرهێنانی زێدە گۆشت .(٢)

ئیتر ئەگەر بەووردی سەیری بەرگی نۆیەم لە هەر نۆزدە بەرگی بەنرخی کتێبەکەی (الحاوى) بکەین ، کە بۆ نەخۆشیەکانی منال نەبوونو هۆیەکانی ـ لای پیاوو ژن ـ تەرخانی کردووە ، ڕەنگە هەندێ دەرمانی تریشمان بەرچاوبکەوێ کە بۆ منال ـ نەبوون هێناویەتیەوەو لە کوردەواریشدا بەکاردەهێنرێ .

(ابن البيطار)و (ابن هبل)و (المظفر الرسولى)و (داود الانطاكى) دەربارەی هەنگوینەوە ئەڵێن : دەرمانە بۆ پەنەمو ئاوسانو ووشك بوونەوەی برینی قووڵ . هەروەها بۆ ددانو پدو (پوك)و گرێو ئاوسانی جێگەی تر وەکو منالدان . وە ئەڵێن نسبەی (شەهوەت) بەهێزر دەکات .(٣)

پزیشکی کورد ملا محمود لە کتێبە دەستنووسەکەیدا (طبا كوردى ل ) ئەڵێ ، کە هەنگوین بۆ (عوزرو بێنوێژی) باشە ، درای ئەوەی لەگەل گیای کیچان دەخرێتە ناو ئاوی شیرتێنو لەناو دەفرێکی گەورە ژن لەناوی دادەنیشێ .

لەمەڕ زەعفەرانیشەوە ، ابن البيطار ئەڵێ ، «زەعفەران دەرمانی ژنەکانی منداڵدان (رحم)ە .. بەلام ئەو منداڵدانەی کە منالی تێدا نەبی » ..

ابن هبل ـ یش ئەڵێ ، زەعفەران «يدر البول وينفع الطحال وينفع من صلابه الرحم وانقباضه واقروح الخبيثه التلآ فيه » .

هەروەها ـ ڕازی ـ یش زەعفەران بە دەرمانی
هەروەها ـ ڕازی ـ یش زەعفەران بە دەرمانی
هەندێ جۆرە نەخۆشی منالدان دادەنێ .(٣)

ئەوەی شایانی باسە ، بابلیەکان ، هەر لە کۆنەوە ، سوودیان لە زەعفەران وەرگرتووەو بۆ چەند جۆر نەخۆشی بەکاریان ـ هیناوەو کردویانە بە

وەرمان ، وەکو پونگو بەروو خــەردەل‌و پەلکە هەنار .. ئاشوریەکانیش لەوانەوە فێری ئەم جۆرە دەرمانانە بوونە .(٥)

توی خورما (طلع) ، کە پــورە حەبسە وەك دەرمان بۆ چەند نەخۆشییەك بەکاری‌هێناوە ، لــە پزیشکی‌ی ئیسلامیدا هاتووەو بۆ چەنــد نەخۆشیەك بەکارهێنراوە . داود الانطاکی ئەڵێ ، هیچ شت وەکو (طلع) نیە ، بەتایبەتی هـــی ورد ، بۆ بەهێزکردنی شەهوەت لای ئافرەت . وە مادەیەکی مەنــەوی زۆری تێدایە . بــۆ خوێــن بینین‌و ئاوسانیش باشـــە . المظفر الرسولی ــ یش توی خورما بۆ خوێن‌وەستان بە دەرمانێکی چاك وەزانێ .(٦)

ئێمە تەنیا گوێز نەبێ شتەکانی تــری دەرمانەکە ناناسین ، دوور نیە هەر « جوزبوا »ش بێ کــە چەند جار ئەنطاکی لە «تذکره اولی الالباب : فصل في ذکــر الادویه الموجبـــه للحبــل ن ٢ ل ١٤٥» ، لەگــەل زەعفەران‌و هەنگوین ، بود دەرمانی منال بوون نــاوی هێناوە . وە ئەڵــێ ، درەختەکــەی بەقەدەر داری هەنارە .. لە هندستان‌و دوورگەکانی «آشیه» شین ئەبــێ .

ابن هبل ــ یش ناوی «جوزبوا»ی هێنـــاوەو بەدەرمان بۆ بێنوێژی دایدەنــێ .(٧)

## دوو نەخۆشی منالدان :

### یەکەم : نەخۆشی «لــوو» :

هەندێك جار لەنـــاو منالدانڵا زیادە گۆشتێ پەیدائەبێ .. ڕەشە وەك پاقلە وایە ... لەنـــاو لەشی ئاژەلیش‌دا پەیدا دەبــێ .. پێی دەوترێ «لــوو» .

**پورە حەبسە ئەڵــێ :**

دوای تەماشاکردنی منالدان ، گەر زێـــدە گۆشت «لوو»ی تیا بێ .. ئەوە ئەزانم‌و .. هەمان دەرمانی پێشوو کە لە «١٨» هەشت شت پێکهاتووە ، هەم بۆ لابردنی «لوو» ەکاو هەمیش بــۆ منال‌بوون ئەیاندەمێ .

### دووەم : کیسی ئــاو

هەندێ جار لەناو منالداندا «کیــسی ئــاو» پەیدائەبێ‌و ، هەروەك پەیدابوونی «لوو» ئەبێتە هۆی منال نەبوون . جا پورە حەبسە ، تەماشـــای منالدان ئەکات ، گەر «کیسی ئاو»ی تیا بوو ، ئەوە هەمان دەرمانی باسکراو پێی ئەدات‌و کیســەی ئاو لائەبات‌و منالدانەکەش چاك‌ئەبێتەوە .. ئەگــەردی منال نەبوون ناقێنێت .

## وەرگەڕانی منالدان :

### پورە حەبسە ئەڵێ :

منالدان ، گەر بە پشتەوە یا بــە لایەکــەوە وەرگەڕا ، ئەبێتە هۆی منال نەبوون . جا کە سەیری منالدان ئەکەم ، ئەزانم کە وەرگەڕاوە یان نا .. گەر وەرگەڕابێ ئەوە راستی ئەکەمەوەو ــ مەگەر خوا ــ ئەگینا منالی ئەبێت .

ئەوەی شیاوی باسکردنە ، ئێست دکتۆرەکان ، بەهۆی بەکارهێنانی چەنــــد جۆرە دەرمانێك ، منالدان راست ئەکەنەوە .

### خوێن‌هاتن لە ــ منالدان ــ ەوە

پورە حەبســە ، بــۆ وەستانی خوێن لـــە ــ منالـــدان ــ ەوە ، دەرمانێکی پێشان دام ... مەیلەو سماقی بوو .. ووتی لە شاری «مدینە» ، لەو کاتەی لەگەل (مام عەلی) چووم بۆ حەج ، کڕیم .

ــ دەرمانەکە تێکەڵ بە (نەبات) و «زەردێنـــی هێلکە» ئەکــەم ... تا ئمێـــودی «ســاردەمەنی» وەرئەگرێ ، تێکی ئەدەم . ئەوسا ســێ ڕۆژ لـــە خورینی ــ هەر ڕۆژێ جارێـــك ــ ئەیدەم بـــە ئافرەتەکەو .. خوێن رائەوەستێ .

### خوێن نەدیتن «بێنوێژ نەبوون»

گەر هاتوو ئافرەتێك بۆ چەند مانگێك «خوێنی نەبینی‌و بێنوێژ نەبوو» .. پورە حەبسە ئـــەم دەرمانانەی خوارەوە بۆ «خوێن بینین» بەکاردێنێت : ددات بەوەدۆنە

١ ــ پەلکە پیازی سوور ئەکوڵێنێ تا وەك دۆشاوی لێ دێت . جا شەش رۆژ لەسەر یەك ، وە لــە خورینی‌یەنە ، هەر رۆژێ پەرداخێك بە ژنەکە دەدات .

٢ ــ ٢ ــ تۆوی تەرەتیزە ئەکوتێ‌و لەگەل دۆشاوی ترێ تێکەلاو دەکات . دوو رۆژ لە خورینی بــە ژنەکە ئەدات .

جا دوای پێدانی یەکێك لەم دەرمانانە ، ژنەکە «خوێن دەبینێ‌و بێنوێژ دەبێ» .

دەربارەی پەلکەپیازی سوور ، کە بۆ خوێن بینین چاکە .. «رازی» ئەڵێ .. ئاوی پیواز دەرمانی بێنوێژبوونەوەو ، هەروەهاش کەرەوزو پونگ .. ـ انطاکی ـ یش پێزازی هەر بۆ بێنوێژبوون بەچاك زانیووە .(٨)

دەربارەی توی (رشاد) .. داود الانطاکی لە «تذکرە اولی الالباب»دا لەژێر ناوی «حرف بنطی»دا ئەڵێ : «رنە یدر الطمش شربا والاءا» .

هەروەها «الملك المظفر» لە «المعتمد في الادویە المفردە» لەژێر ناوی «حرف»دا ئەڵێ کە دەنکی «رشاد» دەرمانی بێنوێژبوونە .

دەربارەی زەردێنی هێلکە کە پورە حەبسە بۆ «هاتنی خوێن لە منالّدان» ەوە بەکاری‌هێناوە .. لە سەرچاوەکانی پزیشکیی کۆندا هاتووە . لەم بارەیەوە (داود الانطاکی) ئەڵێ «واکلە یتدلج ویلحم القروح العتیقە» .. هەروەها ئەڵێ .. سپیی هێلکەش خوێن دادەگرێ .(٩)

(رازی) زەردێنی هێلکە بۆ «ئاوسانو ستووربوونی منالّدان» بەباش دەزانێ . وە ئەڵێ ، سپیی هێلکەش ژانی منالّدان دەشکێنێ .

بەڵێ .. نەك تەنیا ئەمانە بۆ جۆرەها نەخۆشی منالّدان باشن‌و بەکار دەهێنرێن .. گومان لەوە ناکرێ هەندێ جۆر گیا لە کوردوستاندا هەیە بۆ منالّدان چاکە .. بەتایبەتی گیای بەیبونەو پونگو «سیاو» کە «ابن بیطار»و هەندێ پزیشکی تری موسلمانان بەناوی «بخور الاکراد»ەوە ناویان هێناوە .(١٠)

**عەمەلیاتی ژنی تات :**

پورە حەبسە ، کە ئەتدانین ئەوە بلێین باشترین پزیشکی میللی‌یە ، عەمەلیاتی ژنی تاتیش ئەکا . واتە ئەو ژنەی کە پەردەی وەکو پێی مراوی وایە .

بۆ ئەم مەبەستە ، پورە شلەیەك لەم چوار شتانەی خوارەوە دروست‌ئەکات :

سابونی رەقی‌و کشمیش‌و شەکری سوورو سپێنەی هێلکە .

جا سێ چوار شەو ، ژنەکە ئەم شلەیە ئەخاتە سەر پەردەکە تا دەتوێتەوە . ئەوجا پورە حەبسە بە (موسی زێر) عەمەلیاتی بۆ ئەکار .

بەڵی .. وا دیارە ئەم عەمەلیاتە لە (ئامینە)ی دایکی یان (فاتمە مارفی) نەنکیەوە فێربووە . وە مەبەستیش لە بەکارهێنانی ئەم (شلە)یەی سەرەوە ، بۆ ئەوەیە تا لە کاتی عەمەلیات‌کردن زۆر خوێنی لێ نەیەت .

لە پزیشکیی کۆنیشدا ، عەمەلیاتکردنی ژنی تات هاتووە . بەلاّم وا دیارە لە پزیشکیی میللی کوردی باشتر ئەکرێ .. چونکە بە بەکارهێنانی هەندێك شت ئەخوسێنرێ‌و ئەوجا ، هەروەك پورە حەبسە ئەیکات ، عەمەلیات ئەکرێ .

لەم رووەوە ، (ابن هبل) ئەڵێ ، کە چارەسەرکردنی (رتق) هیچ دەرمانی نیە .. تەنیا عەمەلیات (بە هەسن) نەبێ .. ئەوسا دەرمانکردنی بە مەرحەم .(١١)

هەرچەندە پورە حەبسە بە نەخۆشیەکانی ژنان شارەزاو تایبەتە .. بەلاّم لەگەڵ نەخۆشی تریش ئەزانێ .. وەکو (بوونی بەرد لەناو گورچیلە) ، کە گولە گەنمە شامی دەکوڵێنێ‌و ئەدات بەوەی کەبەرد لەناو گورچیلەیدا هەیە بۆئەوەی بەردەکە فڕێبدات .

بۆ بای ناو زگ (غازات)یش ، گوڵە وەنەوشە، کە لە کوردوستاندا یەجگار زۆرە ، ووشك‌ئەکاو ئەهاڕێ ، وە کەوچکێك چای ئەخاتە نێو پیانەیەك ئاوی گەرم‌و ، بۆئەوەی هەڵمەکە دەرنەچێ‌و رەنگ‌بدات ، بە ژێرپیالە سەری ئەپۆشێ .

ئەوسا ، رۆژێ دوو تا سێ جار ئەدات بەوەی «زگەبا ـ غازات»ی هەیە .

**دەربارەی وەنەوشە «بنەفشۆك»**

(داود الانطاکی) ئەڵێ .. «وەنەوشە ـ بنەفشە» لە عەرەبیدا بووە بە (بنفسج) ، بۆ زۆر نەخۆشی بەکەڵکە . بەتایبەتی بۆ سەرئێشەو ئەستووربوون‌و زانەزگ و ئەشك‌و رەبۆو دلەکوتە .(١٢)

(الملك المظفر) دەڵێ : «زهره ینقی المعده ونواحیها من الاخلاط الصفراویه» .(١٣)

شاوی بایشە ئەوە بڵێنی ، کە تا ئێستاش لە ناوچەی بادینان بنەفشۆك (وەنەوشە) لەگەل بەیبسون بۆ کۆکە بەکاردێنن .

**پەراوێزەکان**

١ ـ لە ١ رەر ١٩٨٠ چووم بۆ ماڵی پورە حەبسە ... داقەکەم مام عەلی لە ٢ر ئاداردا کۆچی دوایی کردبوو . ئیتی پورە حەبسە بەم خەفەتەو خەمی (احمد)ی کوڕیشی دەیناڵند . لەناو جێ کەوتبوو .

٢ ــ ابو بكر الرازى ــ (الحاوى)ا « ل ٩ ل ١٥»

٣ ــ لەژێر ناوى «عســل»دا تەماشاى : مفردات ابن البيطار «المعتمد» ، و «تذكره اولى الالباب» بكه . هەروەها «تذكــره ..» لەژێــر ناوى «فرزجه» .

٤ ــ ابن البيطار : كتێبى پێشوو .. «ابن هبــل» «المختارات في الطــب» .. لەژێــر ناوى «زعفران» هەروەها «الرازى» ــ الحــاوى ــ ل ٢ ل ٥٤» وه لەژێــر ناوى «عســل»و «زعفران» تەماشاى الانطاكى بكه . وه دكتــور فائق الجوهر ــ في االصنف التناسلى ل١٤١ ، ١٤٧ .

٥ ــ «تاريخ الطــب العراقى» ــ عبد الحميــد العلوچى ل ٦٣ ــ ٦٤ .

٦ ــ لەژێر ناوى (طلــع) تەماشاى هــەردوو كتێبەكەيان بكــه .

٧ ــ ابن هبل ل ٢٨ .

٨ ــ االحاوى ب ٩ ل ١٧٣

٩ ــ لەژێــر ناوى (بيض) تەماشــاى هــەردوو كتێبەكەيان بكه .

١٠ــ ابن البيطار دەربارەى «بخور الاكراد» ئەڵێ ، ناوى لە ناوچــــەى دياربەكر (سياەبــوە)ەو تەماشاى وێنەكەى بكه .

كورد لە رۆژهەڵاتدا زۆر بۆ (بخور)ى بەكاردێنن .. بەتايبەتى لــە ناوچــەى دياربەكردا . ئيتــر .. دەربارەى چۆنێتى و .. چۆنێتى گوڵەكەى قســەى كردووەو .. ئەم وەسفــەى لە (سقوريدس) يش وەرگرتووەو وتوويەتى : ناوى بــە يۆنانـــــى (اندراسبون)ە .

وه بەورێژى باسى ئەوەى كردووە كە بۆ چى و چى دەرمانە .. وەكو بۆ منالدان ، زگچيلەو پزوكەو برين و گوێچكەو .. بــۆ بلاوبوونەوەى نەخۆشـــى (تاعون) ، دووكەڵەكەى زۆر باشــه .

شياوى باسيشــە ئەوە بلێين ، دوور نيه كــە (ابن البيطار) لە سەدەى سێنــزەم و يــان كۆتايى سەدەى دوانزەى زايينى ، بــۆ يەكەمجار نــاوى (بخور الاكراد) و «سياەبوە»ى فستبێتە نێو كتێب .

بەتايبەتى ابن البيطار گەورەترين پزيشكى گيا ناســه لە ئيسلامدا ..

وه تا تريكى كوردوستان هاتووه .. هەر بــۆ مەبەستى گياناسيشـەوە ئەوروپا گەڕاوە . ئەشتوە باكورى سورياو لە دمشق كۆچى دوايى كردووه .

ئيتر لامان روون نيه هاتۆتە ناوچەى دياربەكر يان نا . وه دوور نيه هەر خۆى نــاوى « ســـوار الاكراد»ى خستبێتە نيــو كتێبان ، كــه گيايێكى پزيشكى زۆر چاكە . وه ئەگــەر بێت و بلێيـــن سەريشى لە كوردوستان نەدابێ ، ئەوه هيچ گومان لەوە ناكرێ ، كە لەبارەى ناسينى هەندێك جــۆر گيا لە كوردوستاندا ، سوودى لە پزيشكانى خەڵكى كوردوستان وەرگرتووه .. بەتايبەتــى زۆر لــــه زانايانى كوردى لە ولاتى شـــام لــه سەردەمــى دەوڵەتى «ئەيوبى» بينيووه .

لەژێر ناوى (بخور الاكراد) تەماشاى كتێبــى «ابن البيطار» بكه . وه لەژێر ناوى «سوار الاكراد» لە «تذكرە»ى «انتاكى» . هەروەها لــەژێر نــاوى (كشت بركشت) تەماشاى كتێبەكەى «ابن البيطار»و «المعتمد»ى «الملك المظفر» بكــه .

«سيابۆ» كە ئێستا بە كرمانجى سەروو پێى دەڵێن ، گيايێكى بۆندارە .. مەترێك يا زياتر بلنــد ئەبــێ ..

(حەزى لە سێبەرى دارو درەختە .. زۆر لــه ديتنى خۆى ئێزيكى ئەو گيايەيە كە زلكەكانى گوڵەكەى كۆ ئەبن وە خەڵك بۆ پاككردنى ددانەكانى خۆيــان بەكاردێنن .. يان هەر نەوعێكە لەوە بەڵام زلكەكانى سيابۆ وەكو ئەو گەورەو كونابــى و بەكەڵكـــى ددان پاككردن نابێ) ..

پزيشكى كورد (مەلا مەحمود) ، ناوى «سيابۆ»ى هێناوەو ئەڵێ : دەرمانى كۆكـــەو تەنگە نەفەسى يە . (طبا كوردى ل ٤) ، وه لــــه «علـــوم الطبيعه»ى «ادوار غالب»ەوە

١١ــ ابن هبل ــ المختارات في الطــب . فەســڵى «في الانفلاق الرحم وهو الارتقاق» .

١٢ــ تذكره اولى الالباب «بنفسج» .

١٣ــ المعتمد «بنفسج» .

# ڕایەخی موسولمانی

جمال قطب نووسیویەتی
ح . ن . ـ وەری گێڕاوە

دەستلێدانێکی هونەری جوانی تابلۆی شارستانیەت هونەری رەسەن لە هەر کۆمەلگایەکدا بێ ئەبینین زۆر ولات کە ئیمپراتۆریەتی لە کۆمەلگایەکدا هەیەو لە کۆمەلگایەکی تردا نیە ، لەبەر ئەوە ئەبینین زۆر ولآت کە ئیمپراتۆریەتی موسولمانی فراوانی لێ پێکهاتبوو ، خاوەنی شارستانیەتێکی کۆنن و پێش موسولمانێتی هونەریان لە ناخی مێژووەوە گەشەی سەندووە .

کاربەدەستە موسولمانەکان پشتی ئەم رەسەنایەتیەی هونەریان گرتبوو هیچ جۆرە زنجیرێکیان نەکردبووە هەنگاونانی کاروانێوە .. هونەرمەند لەخۆیەوە بە نموونەیی یەکانی موسولمانێتیی و گیاندارێتی یەکەوە کاریگەر بوو بەلآم هەندێ شێوازی نوێی ئەوتۆی خستە سەر هونەرەکەی کە لەگەل رووداوە سەرهەلداوەکەی ئاییندا بگونجێ .

ئەنجامی ئەم لەیەکدا توانەوەیە هونەری جۆراوجۆرو شێوازی نوێ دەرکەوتن کە لەگەل هونەری رەسەنی ولآتدا جیاواز بوو ، ئەم شێوازە موسولمانێتی یە نوێ یەش درایە پال خوێندنگە هونەری یەکان و بە هاندانی کاربەدەستەکان گەشەیان سەند .

شتێکی سروشتی یە کە ئەو چاخە رامیاری یانەی کە یەك بەدوای یەکدا هاتن لە شێوەو ناوەرۆکدا کاریان بۆ سەر خوێندنگە هونەری یەکان هەبووە تاوەکو لەگەل رووداوو سەردەمدا شان بەشان بڕوات و ئەمەش نامەی هونەرێکی زیندووە .

جا ئەگەر هاتوو هونەری موسولمانێتی لە خانووکاری و نەخش و نیگارو وێنەو چنین و مافورو شتی تردا سەرنجی جیهان بۆ خۆی رابکێشێ لەبەر ئەم هۆیانەی لای خوارەوەیە .

هونەری موسولمانێتی ئەو برەوەی کە هەیەتی و دەگاتە ئەوپەڕی توانا پەیوەندی بە رەسەنایەتی و جیانەبوونەوەی هونەرمەند لە ویژدانی راستەقینەوە هەیە .. ئەم کارەمەزنەی لە گیانی دلسۆزی و یەكلایەنی یەوە ئەکات هەروەك چۆن خواپەرستی بکات ، هەروەها ئەو بەستنەوە ئاینیانەی کە سنەی شەریف کە بۆ قەدەغەکردنی دروستکردنی وێنەو پەیکەری ئادەمیزاد هێناویەتە کایەوە وای لە وزەی هونەرمەند کرد کە خوو بداتە تایبەتکەری دیاریکراوو ئەم خوودانە وای لێبکات کە فێری بێ و تیا سەرکەوێ و هۆی هەرە بەکاریش بۆ کار باشکردنی هونەرمەند هەر هاندانەکەیە .

ئەبینین هونەرمەندی موسولمان بەلای هونەری خلآفاندن و تەماویدا ناچێت ئەمەش بۆ چێژی خۆی وەك گەڕانێکی خودی وایەو هونەرێکی جێبەجێکراوی بەکەلکی ئەوتۆ بەرهەم دێنێ کە جێدەستی بەسەر ژیانی رۆژانەدا بە هەموو خواست و کەرەسەیەکی وە دابەش دەکات .. واتە بەرهەمەکەی نەك هەر ئەویستری بگرە وەك هۆیەك لە هۆیەکانی ژیان مەبەست ئەبێ .. خۆ ئەگەر هۆی دەروونی گرنگمان نایە پال ئەم هۆیانە کە ئەویش لەژێر سایەی موسولمانێتی دا کەژی ساغی و مسۆگەرکردنی ژیانێکی فەڕبەخشە .. ئەبینین کە کارێکی باش لە سەرچاوەیەکی روناك و خانوویەکی پرشنگاوی و دلنیاکەرەوە شەوق ئەداتەوە .

**با ئەمرۆ یەکێ لە شوێن دەستەکانی هونەرمەندی موسولمان لە تابلۆی مێژووی شارستانیەتدا تەماشاکەین کە ئەویش مافورە .**

### مافور تابلۆیەکی هونەری یە : ـ

**لە نیوەی ئەم سەدەی بیستەمەدا گەلێ بیروباوەڕی هونەری نوێ لە چوارچێوەی ڕێڕەوی تازەی موجۆردا لە ئەوروپا هاتەکایەوە بۆ دامالراوی ئەندازیاری هەیەو کە بایەخ پێدانی نزیکەی سالی ١٩١٢ بوو .. ئەمەش داوی خوری یاخود مەخمەلی چاکترین مافوری بەناوبانگی موسولمانێتی پێ ئەچنرا .. هونەرمەندە ئەوروپایی یەکان لاسایی نەخش و نیگاری موسولمانێتی یان ئەکردەوەو لە لێوارو بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشایانەی کە لەناو تابلۆکانیاندا هەبوو بۆ ئەوەش کە سەر ئەو شێوە موسولمانێتی یەی بدەنێ کە پێیان ئەوت (بالارابیسك) بەکاریان ئەهێنا ئەم کارە هەروا نەوەستا بگرە خۆی گەیاندە زۆر خوێندنگەی هونەریی یەوەو تابلۆکان بە زۆری کۆگایەکی مافوربوون کە نوێترین ڕێڕەوو وێنەکانی تێرو تەسەل بە**

**هونەری (الارابیسك)ی موسولمانێتی گردئەکردەوەو هەر بەمەشەوە نەوەستان نەك هەر برەویان پێدا .**

**بکرە دەسکایەکی زۆر کە بایەخ بە نەمردنی کاری هونەریو برەوپێدانی دەدەن لە جیهاندا هاتن کەوتنە چنینی زۆر تابلۆی بەناوبانگی هونەرمەندە گەورەکان لە هەمەجۆرەی خوێندنگەی هونەریو تەقلیدی هاوچەرخدا کە لە خوریو مەخمەل ئەیانچنینو بە تورەی موسولمانێتی ئەیانرازاندنەوەو ئێستاش زۆری مۆزەخانەکان ئەم کارە هونەریانەیان تێدایە کە جێگەدەستی هونەری نەمری موسولمانێتیان پێوە دیارە .**

**مافور بە کەرەسە تەقلیدیەکەیەوە ئەگەر لە نەمردن بەهێزتر بێ بەرگەی گۆڕانکاریەکانی ئاسمانی بەدرێژی سال ئرىتێ ، ئەو دلنیاییەش هەیە کە ئەو مافوردی هونەرمەندی موسولمان لە هونەرەکەیدا پێکیهێناوە وەك کاری تەلیسم بازی توانیوێتی سەرنجی بایەخداران بۆ کاروانی پێکهێنانی هونەریو پێشکەوتنی لە چاخی نوێدا رابکێشێ .. بەلام ئەو پارچە مافورە دەگمەنانەی کە هەموو رۆژ دەنگوباسەکانیانمان دەزانی کە بەنرخترین پارچەن لەلای مافوربازو کۆکەرەوەی پارچەو کۆمەلگەی شوێنەوارو مۆزەخانەکان ــ گەیشتنە نرخێك بە دراو کە لە پلەی نرخی تابلۆی هونەری نەمری هونەرمەندە گەورەکانی مێژوو بالاتر بوون .. ئیتر مۆزەخانەکان وایان لێ هاتوو شانازیان بە هەلگرتنی پارچەیەك مافوری موسولمانێیەوا دەکردوو . جا چەند ئەم پارچانە بە درێژایی سەدەکان لە کۆنیو**

رەسەنێتیو مێژوویاندا بهاتنەکایەوە ئەوەندەش هاواری شانازیکردن پیانەوە بلندەبووەوە .

**هونەرو پسپۆڕێتی : وتمان پێشەسازی مافور لە کۆنترین سەبەوە لای هۆزە گەرۆکەکان** ــ ئەوانەی کە بە لەوەڕی مەرو حوشترو بزنەوە خەریك بوون ــ پەیدابوو ، دوای ئەوەش ئەو کەرەسە خاوە وەك خوری پێویست بۆ ئەم پیشەسازیە زۆربوو .. تا ئێستاش بەلای هۆزە شوانکارەکانەوە پیشەسازی مافور بایەخدار ترین پیشەیە .. ئەم پیشەیە لە ولاتی موسولماندا بەتایبەتی لە سەددی نۆی کۆچیدا (یازددی زاین) پەردیسەند ، لەبەر ئەوە هونەری مافور ئەگەر لەگەل هونەری تری موسولمانێتیدا وەك خانوکردنو نەخشە کێشانو وێنەو هونەری جێبەجێ هەمەرەنگ بەراوردبکرێ بە نوێترین هونەری موسولمانێتی دادەنرێو لە سەرەتاوە تا ئەمڕۆ بە یەکەوە هاتوون لێك جیانەبوونەتەوە .

پیشەسازی مافور بەتایبەتی لە ئەنادۆلدا پەردی سەند هەروەها ناوڕاستی ئاسیاو قەفقاسیش کە نزیك ئەم شوێنە بوونو دوایی ولاتە موسولمانەکانی تری وەك دوورگەی عەرەبیو میصرو سوریاو سەروی ئەفریقاو ئەندەلسو نیمچە دوورگەی کیشوەری هندستانو شوێنانی تر .

ئەو مافوردی کە بەتووکن (توکن) یان ئەوانەی کە کونی گرمۆلەی دەنك دەنك داپۆشیون باشترین جۆری مافورەو بە

ئەستوراییو بە بەرگە گرتنو خۆشی دەست لێدانیدا دیارە .. ئەمە بێجگە لەو پلە هونەریە بەرزدی کە هەیەتی .. ئیتر هەروەك خوری لە پیشەسازی مافوردا بەکاردەهێنرێ کەتانو ئاوریشمو لۆکەش بەکاردەهێنرین لەم سالانەی دواییدا هەندێ کارگەی پیشەسازی هاتن داوی زۆریان لە پلاستیكو بەرهەمی پەترۆلیو کیمیایی تر دروستکرد بەلام هیچ نرخێکی هونەریان نەبوو دوورە لەو مافورە هونەریە کۆنەی ئێمە مەبەستمانەو مافوری دەستە ــ کە ئەویش بەو جۆرەیە لەگەل داوی خوریەکی نایابدا داوی زێڕین یان زیوینیان تێکەلاو ئەکرێو گرێکانیان، هەندێ جار لە کۆتایی داوەکان ئەئالێن بەجۆرێك کە چواردەوری گرێکە لەسەر ڕوی مافورەکە دەرکەوێ .. لەم باری گرێیەشەوە پێشەسازیە موسولمانەکان گەلێ جۆر گرێیان لە دروستکردنی مافوردا زانیوە .. چەندە گرێ زۆربووبێ ئەوەندە چنینەکە سفتو ئەستوو بووەو ئەوەندەش نرخی مافورەکە زۆربووە .

وەك لەوەوپێش وتمان خوری شتێکی باوی بەکار هاتووە بەزۆری لە پیشەسازی مافورداو چونیەتی ئەم خوریەش ئەگەڕێتەوە بۆ شوێنی ئەو مەڕانەی کە ئەم خوریەیان لێ بڕاوەتەوە ، هەروەها جۆری لەوەڕو ئاوی خواردنەوەش لەو شوێنەدا پەیوەندیان بەسەر چونیەتیو برەوی ئەو خوریەوە هەیە . ئەوەی لە جیهانی ئەم پیشەسازیە هونەریە کۆنەدا ئاشکرایە ئەوەیە کە باشترین

خوری‌یه‌یه که له‌ناو شان ده‌کرێته‌وه‌و ئه‌ودشی که خراپ بێ خوری به‌ر ورگ‌و لاقه‌کانه‌و هه‌ر به ره‌نگه ره‌سه‌نه‌که‌ی خۆیه‌وه بێ هیچ ره‌نگ تێکه‌ڵاوکردن به‌کارده‌هێنرێ .. خۆ ئه‌گه‌ر هاتوو ردنگی ده‌ستکردیش به‌کارهێنرا شاردزاکانی مافور (مافوریش شاردزاو پسپۆڕی خۆی هه‌یه) ئه‌و ردنگانه به‌لایانه‌وه باشه که له که‌ردسه‌ی سروشتی‌یه‌وه پێکهاتووه ئه‌ندامی بێجا یان رووه‌کی ره‌نگه کیماگه‌ری‌یه نوێکاز بێ .. دوایی ئیتر ئه‌و ردنگه‌و جوانی‌یه‌که له بریقه‌دانه‌وه‌و نه‌رم‌و نۆڵی خوری‌یه‌که‌دا دیاری ئه‌ده‌ن .. واته ره‌نگی ده‌ستکرد په‌سه‌ند نی‌یه‌و بێ بایه‌خه که هیچ ئه‌م جۆره جوانیانه‌یان نیه .

پیشه‌سازی مافور ودك کارێکی هونه‌ری پێگه‌یشتوو ـ هه‌ندێ خێزان له ولاته موسوڵمانه‌کاندا پسپۆری‌یان تێیدا هه‌یه‌و پشتاوپشت هاتۆته خواره‌وه به‌جۆرێك که هه‌ریه‌که رێبازی خۆی هه‌یه جیا ئه‌م رێبازه چ له‌رووی پێشه‌سازی مافوره‌وه بێ یاخود له پله‌کانی نه‌خشه‌کێشاندا بێ .. هه‌ر ده‌سته‌یه سوربووز له‌سه‌ر ئه‌ودی که شێوازه‌که‌ی چاك بزانێ‌و پێشی بخات ، له‌م ناکۆکی مه‌رنه‌دا که‌له‌پوری شارستانیه‌ت ئه‌م شوێنه به‌رزدی ده‌ستکه‌وت که کۆڕه هونه‌ری‌یه‌کانی له هه‌موو لایه‌کی جیهاندا ئاوه‌دانکردۆتۆ .. ئه‌م شێوازانه خۆیان له هونه‌رمه‌ندێکه‌وه بۆ هونه‌رمه‌ندێکی ترو له خێزانێکه‌وه بۆ خێزانێکی تر کاری خۆیان کردووه . ئه‌بینین که جۆره‌کانی دووباره هه‌ی ولاتێ له‌گه‌ڵ ولاتێکی تردا ـ ئه‌و ولاتانه‌ی که ئه‌م پیشه‌سازی‌یه‌ی تێیدا پێگه‌یشت ـ جیاوازی هه‌یه .

به‌ڵام مافوری تورکیا .. له ناوبانگدا وای لێ هاتووه که هیچ شتێکی له مافوری ولاتانی تر که‌متر نه‌بێ‌و گه‌لێ جۆریان وه‌ك مافوری هولباین ، په‌له‌وه‌ردا ، مافوری ترانسلڤانیا ناوبانگی گه‌وره‌یان هه‌یه .. دووباره ئه‌م ته‌رخان کاریه‌ش له هونه‌ری دروستکردنی مافوردا له سه‌ده‌کانی یازده‌و دوازده‌ی دوای کۆچیدا واته (١٧ و ١٨) زاین له ولاتی ئه‌نه‌دۆڵدا گه‌یشته پۆپه .

خۆ ئه‌وه مافووری نوێژی تورکیایی خۆی دیاره که دوو میحرابی گرێداری تێدایه وه‌ك گۆشه‌وان‌و ئه‌م گۆشه‌یه‌ش دوو لقی راست هه‌ڵیان‌گرتووه ، هه‌روه‌ها به‌کارهێنانی گوله به‌ناوبانگه‌کانی تورکیاش له‌م نه‌خشه هونه‌ری‌یه‌دا وه‌ك . گوڵی سونبوڵ‌و ده‌شته‌کی‌و شاخی ئاسك‌و گوڵی قه‌ره‌نفه‌ل ، باوه که پێکهاتووه رووه‌کیه‌کانیان له مافوری تورکیادا هونه‌رمه‌ند به‌شێوه‌یه‌کی چه‌ماوه چه‌ماوه‌یه‌کی ئه‌وتۆ که له شێوه سروشتی‌یه‌که دووریان‌ده‌خاته‌وه نه‌خشیان ده‌چنێ . به‌ڵام ئه‌وه‌ی که شوێنی بایه‌خه بۆ جیاکردنه‌وه‌ی مافوری تورکیا له مافوری ولاتانی تر ئه‌وه‌یه که مافوری تورکیا نووسینی‌و به‌کارهێنانی وشه‌ی (هیجائی) یان که‌م تیایه واته به پێچه‌وانه‌ی مافوره‌کانی تره‌وه که یه‌کجار هیڵ‌و نووسینی وشه‌و شیعریان له چنینی ئه‌م هونه‌ره‌دا به‌کارهێناوه به‌ڵام ئێمه ئه‌وه‌ی سه‌رنجمان راده‌کێشی ئه‌و شته له‌روانه‌یه که له سه‌ده‌ی ده‌یه‌می کۆچیدا له مافوردا جیاوازی‌یه‌کی کاکڵه‌یی بۆ پێکهێنای مافور له‌روی پێکهاتووه نه‌خشاوی‌یه به‌کارهێنراوه‌کانه‌وه وه‌ك روی ره‌نگه‌کان هێنایه پێشێ .

چۆن .. ؟ ئه‌بینین هه‌ندێ پیشه‌سازی‌یه‌کانی (قاهیره)و موسولمانێتی له‌م سه‌رده‌مه‌دا که لێی دواین به هونه‌ری (مافوری مصری) ناوده‌به‌ن واته کارگه پیشه‌سازی‌یه‌اکانی (قاهیره)و هونه‌رمه‌نده‌کانی (مصر)ن سه‌رچاوه‌ی به‌رهه‌می مافور نه‌ك تورکیا ، ئه‌مه‌ش ئه‌گه‌رێته‌وه سه‌رده‌می مه‌مالیکه‌کان .. ئه‌و ده‌مه‌ی که عوسمانی‌یه‌کان له سه‌ره‌تای ده‌ی کۆچیدا (١٦) زاین له (مصر) دا ده‌سه‌لاتیان وه‌ده‌ستگرت که زۆر له‌و پیشه سازی‌یه به به هایانه له (قاهیره) دا کۆبووبوونه‌وه که ژماره‌یه‌کی زۆری ئه‌م چابوکی‌و شاره‌زایی‌یه (مصر) ی‌یه خۆیان گه‌یانه تورکیا بۆ ده‌رخواردانی کاری هونه‌ری له زۆر پیشه‌سازیدا . له‌م رووه‌وه گۆڕانێکی کوتوپڕ له ره‌نگ‌و نه‌خشه‌کانی مافوری تورکیادا بۆ تێکه‌ڵاوبوون په‌یدابوو که هیچ په‌یوه‌ندی‌یه‌کی به‌و شێوه کۆنه‌وه نه‌بوو که له تورکیادا باوبوو . ئه‌م گۆڕانه کوتو پڕی‌یه‌ش ئه‌وه‌یه له‌و کاته‌وه ره‌نگی سه‌وزو سوورو گونجانی ره‌نگه‌کانی چوارچێوه له‌گه‌ڵ ره‌نگه‌کانی ناخۆی مافوری تورکیا له‌یه‌ك دوورن .

جا هه‌رچه‌نده سه‌رده‌می نوێ شێوه‌ی پیشه‌سازی زۆره‌و ده‌ستی به‌سه‌ر چابووکی‌و هونه‌ری ورده‌کاریدا گرتووه به‌ڵام مافوری ده‌ستکرد که ولاتانی موسوڵمان ناوبانگیان پێوه ده‌رکردووه نرخه هونه‌ری‌یه‌که‌ی خۆی پاراستووه .

# پانزده نووسەر، پانزده کتێب رووی مێژوویان گۆڕی

ئامادەکردنی محمد بەدری

— ١ —

شانزده نووسەر ، شانزده پیاوی دانا ، شانزده کتێبیان بلاوکردەوه وبەم کتێبانه توانییان سەرتاپای مێژوو بگۆڕن وشۆڕشێکی گەوره له ژیانی کۆمەڵو ئادەمیزادو سرۆشتدا بەرپا بکەن .. کتێبەکانیش ئەمانەن :

١ — میر —الامیر — نۆوسینی : نیکولوماکیافیلی ساڵی ١٥١٧ ز .. ئەم لیکۆڵینەوه رامیاری‌یه بەهەر بیستو شەش بەشەکەی له دەسەڵاتداری دەکۆڵێتەوه — چونیەتیی گەیشتنی پێی‌و پاراستنی — .

دەسەڵاتدارەکانی پێشووی وەك بەڵگە بۆ نموونه بەکارهێناوه وبەشانوباڵای سیزار بورجیای وەك میرێکی هەڵکەوتوو شانازی‌ی کردووه — میکافیلی دەڵێ : گرنگ نیی‌یه کەلای خەلکی خۆشەویستبیت ، گرنگ ئەوەیە بتوانی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ خاوەن دەسەلات بی ، واته پێویسته بەهەمیشەیی بیر لەوه بکەیتەوه بتوانی له شوینەکەی خۆت بمێنیتەوەو بیر له چاکەو چاکە کردن نەکەیتەوەو به کورتی ئەوەت لەبەر چاوبێ کە بتوانی بەهەر هۆیەك بێ به ئامانج بگەیت ، واته ئەوەی گرنگ بێ ئامانجەکەیه .

٢ ـ شۆرشی ئەستێرەکانی ئاسمان .. نووسینی نیکۆلای کۆبەرنیکۆس لە ساڵی ١٥٣٠ ـ ١٥٤٣ ی.ز . زانای ئەستێرە ناسی پۆڵەنـدە بەردی بناغەی زانیاریی فەلەکی دانـا پاش ئەوەی توانی وتەکانی بتلیمۆس وەرگێڕێتەوە .. کتێبی (شۆرشی ئەستێرەکانی ئاسمان)ی لە ساڵی ١٥٣٠دا تەواو کرد بەڵام تا ساڵی ١٥٤٣ بڵاونەکرایەوە .. لەم کتێبەیدا تیورییەکەی دەرخست کە دەڵێ : زەوی مەلبەندی جیهان نییە ، چونکە زەوی‌و ئەستێرەکانی‌کە بە گشتی هەر یەکێك بە شێوەیەکی جیاواز بە دەوری رۆژدا دەخولێنەوەو لە هەمان کاتیشدا بە دەوری خۆیانیشدا دەسوورێنەوە .. ئایین لەو سەردەمەدا دژ بەم تیورییە راوەستاو کۆبەرنیکۆ سیش تووشی بەربەرەکانییەکی زۆر بوو .

٣ ـ سووڕانی خوێن : دانانی ولیەم هارفی لە ساڵی ١٦٢٨ی ز..

ئەم لیکۆڵینەوەیە لە ساڵی ١٦٢٨ بڵاوکرایەوەو دانەرەکەی باسی ئەو دۆزینەوەیە دەکات کە لە ساڵی ١٦١٦ دا هەستی پێکردووە ، ئەوەیە کە خوێن لە لەشی ئاژەڵەکاندا دەسووڕێتەوە .. ئەو دۆزینەوەیە لە بواری فیسیۆلۆژییادا هەنگاوێکی بەرەو پێشەوە بوو .

٤ ـ بیروڕا .. دانانی ئیسحاق نیوتن لە ساڵی ١٦٨٧ زدا . نیوتن کتێبەکەی کردە سێ بەشەوە : جموجۆڵی لەش ، جموجۆڵی لەش لەناو دەوروبەرێکی بەرگریکەردا ، رژێمی جیهان نیوتن بەرگرییەکی زۆری لە بیروڕایەکانی خۆی کرد بەوەی کە رووداوێکی زۆری کردە بەڵگەو پێشنیاری پاسایەکی تازەی بۆ ڕاکێشان کرد وهەر لەو کاتەدا دانەر سەرەتای سەردەمێکی نوێی بۆ دۆزینەوەو تاقیکردنەوە دەست نیشان کرد

٥ ـ خووڕەووشتی ڕاست.. دانانی تۆماسن‌پین لە ساڵی ١٧٧٦ زدا..

ئەم پەخشنامە ڕاستەوخۆیە کە لە چەند مانگێکی زۆر کەمدا زیاتر لە سەد هەزار کەس لە دانیشتوانی هەرێمەکانی ئەمریکا کڕییان‌و هەوڵی ئەوەیاندا لە ئینگلستان جیابینەوەو داوای سەربەخۆیی بکەن .. دانەری ئەم کتێبە لەلایەن دەوڵەتی بەریتانیا . بە تاوانی خیانەت کردن درایە دادگا ، بەناچاری پەنای بردە وڵاتی فەرەنسەو وەك هاووەڵاتی‌یەکی شەرەف لەوێ قبووڵ کرا .. تۆماس‌پینی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا گیانی بە خاك سپێرا .

ـ ٢ ـ

٦ ـ سامانی نەتەوەکان .. دانانی ئادەم سمێس لە ساڵی ١٧٧٦ زاییندا ..

ئەم کتێبە دەربارەی ئابوورییەو دانەرەکەی داوای ئەوە دەکات کە دەوڵەتەکان رژێم‌و بیروڕایەکی سەربەست دەربارەی ئابووری پەیرەو بکەن‌و دروشمی : (با ئیش بکات .. با تێپەڕێ)یی داوا دەکرد ..

٧ ـ تیووری دانیشتووان .. نووسینی تۆماس‌رۆبرت مالتۆس لە ساڵی ١٧٩٨ زاییندا ..

لەو سەردەمەدا کە مالتۆس بوو بە قەشەی کلیسەی ئنیگلستان ئەو تیورییە بەناوبانگەی دانا کە تێیدا دەڵێ : دانیشتوان بەپێی بەرودوایەکی (متوالیە)هەندەسی زیاد دەکەن ، بەڵام خواردەمەنی بەپێی بەرودوایەکی مەتماتیکی زیاد دەکەن ، ئەوەشی دەرخست کەشتە خراپەکانی کۆمەڵ وەك گوناح‌و نەخۆشی‌و شەڕ ، زۆر پێویستن بۆ کەمکردنەوەی ئەو زیاد بوونە .. لە ساڵی ١٨٠٦ دا وپاش ئەوەی کە مالتۆس بیری تیورییەکەی دوبارە کردەوە پێشنیاری ئەوەی کرد کە سنوورێك بۆ زاوزێ کردن دابنرێ .

٨ ـ یاخی‌بوونی مەدەنی .. دانانی هنری داڤید تۆرۆ لە ساڵی ١٨٤٩ زاییندا ..

ئەم وتەیە سەرچاوەی وتە بەناوبانگەکەیە کە دەڵێ :دەوڵەتی چاك ئەو دەوڵەتەیە کە بتوانێ

بە کەمترین شت حوکم بکات . نۆرۆ بەوەشی وت : مرۆڤ پێویستە لەگەڵ خوێدا راستگۆ بێ زیاتر لەوەی کە لەگەڵ ئەو دەوڵەتە راستگۆو دڵ سۆز بێ کە ئادەمیزاد بۆ خۆی دروستی کردووە .. لەوانەی لە بیروباوەڕدا لە گەڵیدا بوون : مۆهانداس گاندی ، ئەوەی کە یاخی بوونی مەدەنیی بە «بەرگری‌کردنی سەلبی» کردە زمانی هیندستانی وپاش بە ناوی خۆپێشان دان یاخود مانگرتن بۆ ئەمریکا گەڕایەوە .

٩ - کەپرەکەی مامە تۆم .. دانانی هاربیت بیتشرستو لە ساڵی ١٨٥٢ زاییندا ..

لە راستیدا ئەم کتێبە ناونیشانێکی لابەلایە کە ئەمەیە «ژیان لە نێوان ناکەسەکاندا» وکتێبەکە چارەسەری گیروگرفتی کوێلەکانی خواروی ئەمریکا دەکات‌و ئەم ئافرەتە کە دانەری ئەم کتێبەیە هاوبەشی‌یەکی رۆژی لە نەمانی کویلەتی ی‌کرد .

١٠ - بنچینەی (جۆرەکان) دانانی تشارلز داروین لە ساڵی ١٨٥٩ زاییندا ..

تیوری پەرەسەندن لەکاتی خۆیدا تیوری‌یەکی شۆڕشگێڕانە بوو وتا رۆژی ئەمڕۆش بەچاوێکی پڕ رێزو ئیحترامەوە سەیر دەکرێ .. داروین ئەوەی پیشاندا کە شت وردە وردە پەرە دەسێنێ ، ئەو پەرەسەندنەش بەپێی هەڵبژاردنی سروشتی دەکرێ .. واتە دارودرەخت‌و ئاژەڵ بەپێی گۆڕینی ژیان ناچارە خۆی بگۆڕێ «بەوەی کە نەوەیەکی تازە دێت لەوەی پێشوویدا زۆر جیاوازە ، ئەمەش بۆ کرۆمۆسوماتەکان دەگەڕێتەوە» واتە ئەو مرۆڤەی کە دێتە دو نیاوە ناچارە لەگەڵ دەوروبەرەکەدا بگونجێت بۆ ئەوەی بە زیندویی بمێنێتەوەو نەوەی نۆی وەك خۆی دروست بکات .



١١ - کارتێکردنی هێزی دەریایی لە مێژوو .. دانانی ئەلفرێد تایرماهان لە ساڵی ١٨٩٠ی زاییندا ..

نووسەری ئەم کتێبە ئەفسەرو مێژوو نووسێکی دەریایی ئەمریکایی بوو وهەوڵی ئەوەی داوە ئەوە دەرخات کە هێزی دەریایی بۆ بەرگری لە خۆکردن سەبارەت بە نەتەوەکانەوە شتێکی زۆر گرنگ‌و کارایە .. ماهان لە کۆلیجی جەنگی لە بەیرووت مامۆستای تەکنیکی دەریایی بوو .. بیروڕاکانی ماهان کارێکی زۆریان لە دارشتنی رامیاری دەریایی وڵاتە یەکگرتووە کانی ئەمریکاو ئینگلتەرەو ئەڵمانیا کرد .

١٢ - لێکدانەوەی خەونان دانانی سیگمۆند فرۆید لە ساڵی ١٩٠٠ی زاییندا .



ئەم کتێبە بریتی‌یە لـــــە زۆر زوو دەربارەی دۆزینەوە کانی فرۆیـــد پاش ئەو شیکردنەوە

ەوورودێژەی کە دەربارەی خەون کردوویەتی‌و ئەو سیکردنەوەیەش یەکێك بوو لـەو هۆیانەی که فرۆید له لێکدانەوە کانی‌دا بەکاری هێنا ..

نەخۆشـەکە خەونەکانی دوو بارە دەکاتەوە وبەم جۆرە مانایـــە رەمزی‌یەکانی دەدۆز زێنەوە .

فرۆید بڕوای بەوە بوو کە ئەم خەونانە لـــــە ئەنجامی هەستە کپ‌کراوەکاندا پەیدا دەبـن‌و

دووریش نی‌یە ببن بەهۆی پەیدابوونی نەخۆشی یەکانی دەروون .

١٣ ـ بنەڕەتە جیوگرافیایەکەی مێژوو .. دانانـی هالفۆرد ماکیندر لە سالّی ١٩٠٤ی زایین‌دا .

ئەم لیکۆلینەوەیە دەربارەی هۆیـە جیوگرافی‌و ئابووری و مرۆڤایەتی‌یەکان‌و کارتێکردنیان لـە

رامیاری‌یـــە دەردکی‌یە کـــەی دەولەتانـدا

دەکۆلێتەوە . وەك زۆریەتی دانیشـــتو وان‌و دابەش کردنیان .. هالفۆرد کە لە زانکـــۆی

لەندەن مامۆستا بوو توانـــی جیوگرافیا وەك بابەتێکی ئەکادیمی‌یانە بچەسپێنی‌و لە پاشـان

بوو بە بەڕێوەبەری قوتابخانەی ئابووری لـــە لەندەن . ئەم کتێبە بریتی بوو لە بیستو چوار

لاپەڕەو دانەرەکەی بڕوای بەوە بوو کە ئۆراسیا (ئەوروپاو ئاسیا) بنەڕەتە جیوگرافی یەکـــەی

مێژووە .. وڵاتە یەکگرتووە کانی ئەمریکـــاو ئینگلتەرە لە پێش شەڕی دووەمی جیهانـی‌دا

ئەم تیوری‌یەیان پشت گوێ خست بــــەلاّم ئەلمانەکان بۆ پشتگیری کردنـی رامیاری‌یـە نازی‌یەکەیان بەکاریان هێنا .

[illegible] ـ دوو تیوری‌یە تایبەتی‌و گشتی‌یەکە .. دانانـی ئەلبرت ئەنشتاین لە سالّـی ١٩٠٥ ، ١٩١٦ی زایین‌دا . زانای فیـــــزیا ناسی ئەلمـــان ـ سویسرە ـ ئەمریکا ئەنشتاین تیوری‌یـــە



تایبەتی‌یەکەی دەربارەی نسبیە لە سالـــی ١٩٠٥ی زاییـــن بلاّوکردەوەو تیوری‌یـــە

گشتی‌یەکەی دەربارەی هەمان بابەت لە سالّی ١٩١٦دا . هەرچەندە ئـەم دوو تیوری‌یە زۆر

ئالۆزانە مەسەلەی قلیشاندنی ئەتۆمیان ئاسان کردەوەو بوون بەهۆی پەیدابوونی بۆمبـــای ئەتۆم کەچی پا داشتی نۆبلیان پێ نەبەخشرا .

١٥ ـ خەبانی من .. دانانی ئەدۆلف هتلەر لە سالّی ١٩٢٥ی زایینی‌دا .

ئەم کتێبە لەو سەردەمە دانراوە کە هیتلـەرو رۆدۆلف هس پێکەوە لە بەندیخانە بوون ، ئەم دوو زەلامە لە پاش یاخی‌بوونەکەی سالّـــی ١٩٢٣ دا گیران‌و خرانە بەندیخانە .. ئــەو

یاخی‌بوونە سەرنەکەو تــووە دەیەویســت حکومەتە بافاری‌یەکە بڕووخێنێ .. کتێبەکـە هەرچەندە بریتی‌یە لە یاداستو کاروانی ژیانی هتلەر خۆی بەلاّم نەخشـەیەکی رامیاری‌یانەیە بۆ زالّبوونی ئەلمانیا بەسەر جیهاندا .

چیرۆکی گەردوون !

# "گالاکسی"یە گەڕۆکەکان دروستی دەکەن

نووسینی : نبیل فريد السخن
مصطفى صالح كريم
لە عەرەبیەو کردوویەتی بە کوردی

نیوتن ، بــــه سوودوەرگرتن لە کوپرنیکوس‌و گالیلیۆ ، لەنێوان پێوەندی هێز بە (ئەکسیلەریشنەوە (تسارع) ) توانی بکاتە یاسای (کراڤیتێشن یەکتــر راکێشان) وە سەلماندی کە گەردوون لە ژمارەیەکــی بێ‌پایان ئەستێرەی چەسپاو لە شوێنی خۆیاناو بــه ڕێك‌وپێکی دابەش‌کراو پێك‌هاتووە .

گەردوون لە سەدەی بیستەمدا ، پشتی بــه ژمارەیەکــی دەست‌نیشان‌کراو لــــه گالاکسییەکان بەستووە ، وە کەرەستەو تیشك‌دانەوەو کات‌و جێگا پێك‌هاتووە .

لە شەوێکی مانگ هەڵنەهاتوودا ، ئەگەر بــۆ ساتێکی کورت سەیری ئاسمان بکــەی وا زان‌دەکەی گەردوون لەنگەر گیراوە . ئەستێرەکان بێ جووڵــەو بێ هیچ جۆرە چالاکییەکی ئەوتۆ لە شوێنەکانیــاندا هەڵواسراون ، جگەلەو ورشە کزانـــەی بەچـــاو هەستی‌پێ‌دەکەی هیچی دی بەدی ناکەی . کاکی برا، ئەگەر وای بۆچووبی ئــەوا بەهەڵەدا چووی ، ئــەو بەشە کەمەی گەردوون کەبەچاو دەی‌بینی وەك هەموو بەشاکانــی دی گەردوون کەبەچالاکی‌و جم‌وجۆڵ ، ئەستێرەکان بە خێراییەکی گەورەی وا کە لەبــــەر دووری‌یان تێ‌بینی ناکەین دەجوولێنەوە ، وە لە هەر ساتێکدا لەم گەردوونەدا ئەستێرەی گەورەو بچووك دەمرن‌و هی‌دیش لەدایك‌دەبن . واتــــه ناوجەرگەی چالاکییەکی هەمیشەییە لە بلیۆنەها ساڵەوە کە بــه توندی تەقیوەتەوە تا ئەمــــڕۆش دەنگ‌دانەوەکەی دەبیستین .

## « پێش کوپرنیکـوس »

ئادەمزادی کۆن حاڵی لەحاڵی ئەو کەوسەی ئەو شەوە سەیری ئاسمانی دەکردو ، وای‌دەزانی لەنگەری گرتووە باشتر نەبوو ، هیچ جۆرە هۆیەکــی تێبینی‌و سەرنج دانی نەبوو جگــــە لە هەستەکانی نەبێ کــه زیرەکانە بۆ راژەی مەبەستی رۆژانەی ژیانی خــۆی بەکاری دەهێنان ، بەهۆی ئاووهەوای باش‌و ئاسمانی بێگەردەوە دەشێ میللەتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاســـت یەکەم کۆمەڵ بووبن کە چاویان بڕیبێتە ئەستێرەکان، لە ئەنجامدا بۆیان دەرکەوت هەندێ لــەو ئەستێرانە لە شێوەی کۆمەڵ کۆمەڵی خــاوەن شێوەیەکــــی دیاردان ، ئەوانیش بەبـــێی بۆچوونی خۆیــــان دابەشیان‌کردن (وەك چۆن ئەمڕۆ بە هەسارە (کوکبە) یان وێنـــەی فەلەکـــی Constell Ations ناودەبرێن ) ، بۆ نموونە لە دەرکەوتنی هەسارەیەکدا موژدەی هاتنی وەرزێك بوو بەلایانەوە ، یان کاتــی کشتوکاڵ ، یان درەو .. تا .. د .

دەبێ بابلییەکان یەکەم میللەت بووبن کــــــه دەربارەی تێبینی‌یە فەلەکییەکانیان نووسینیان بــۆ بەجێ‌هێشتووین ، فەلەکییــەکانیشیان وورد‌بیــــن بـــوون . لە قوللەکانیانەوە سەیــری ئاسمانیـــان دەکردو بزووتنەوەی رۆژو مانگ‌و ئەستێرەکانیان بە ووردی لێك‌دەدایەوە ، بە درێژایی ساڵ ووردبوون‌لە کارەکانیانا ،- لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەکانیانا گەیشتنە ئەوەی لە خەیاڵی خۆیانا وێنەیەك بــــە گەردوون بکێشن کە زەوی چەقی گەردوان‌بێ ، چونکە بەلایانەوە وابــــوو زەوی خەپلەیەکی بەرینە ئـــــ دەورەی داوەو چیاکانیش کە گومەزی ئاسمانی لەسەر بەندە سنوورەکانییەتی ، لــــه گومەزی ئاسمانیشدا چەند دەرگایەك هــــەیە بـــۆ چوونەژوورەوەو جوونەدەرەوەی ئەستێرەکان ، وە دەبــێ ئـــەم گومەزەش بە ئاو دەوەدرابێ تا ناوناوە ببێتــە باران‌و ◁

بباریَ .

میسرییە پێشینەکانیش لە تێڕوانینیانا بۆ گەردوون چ جیاوازییەکیان لە بابلییە هاوچەرخەکانیان نەبوو لەوەداکە زەوی چەقی گەردوونە ، بەرینە ، گومەزی ئاسمانی لەسەر ڕاگیربووە ، بەڵام بەپێچەوانەی بابلییەکانەوە ئەم تێبینییانەیان لەئەنجامی سەرنجدان و لێکدانەوەوە نەبوو بەڵکو پشتیان بە باوەڕە ئایینییەکانیان بەستبوو ، گومەزی ئاسمان، لای ئەوان لەشی خواوەند (نت = )ی خۆیانە کە بە ئەستێرە رازێنراوەتەوە ، پاڵپشتەکەشی باڵەکانی خوای هەوا ( شو یە ، رۆژیش لە بەلەمێکدادانیشتووە و هەموو ڕۆژێ بەناو لەشی (نت)دا دەڕوات .

بەڵام یۆنانییەکان کە بەهۆی بازرگانییەوە پەیوەندییان بە بابلی و میسرییەکانەوە کردبوو ، لێیانەوە فێری سەرنجدانی ئەستێرە و هەسارەکان بوون ، بەڵام بیروڕا و تێگەیشتنی خۆیانیان دەربارەی گەردوون پێشتر خست ، زانای ئەندازەی بەناوبانگی یۆنانی (پیتاگۆرس) مەسەلەی بەرینێتی زەوی گۆڕی بە (گۆیی)و بە شتێکی چەسپاوی چەقی گەردوونێکی شێوە گۆییدا ، دانا .

ئەرستۆش ئەم شێوەو وێنەیەی گەردوونی بە بەڵگەی مەنتیقییەوە پەسەندکرد ، زەوییە گۆییەکەی لە چەقی گەردوونێکی تەواوی نەگۆڕدا دانا ، بۆ ماوەی ٢٠٠٠ ساڵ ئەم بۆچوونەی ئەرستۆ دەربارەی گەردوون تاقە بیرۆکەی باوو پەسەندبوو ، تەنانەت کڵێسەش لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بۆ بەکارهێنانی دەسەڵات و هێزی خۆی ئەمەی کردە جۆرە بڕوایەك دیارە کە ئەم بڕوایەش کارێکی گەورەی کردە سەر بیری ئەورووپای رۆژئاوا . تەنانەت چوونە دەرەوە لە چوارچێوەی ئەم بڕوایە هەندێ جار بە کوفر دادەنرا بەڵگەکانی مەحکەمەکردنی گالیلیۆ کە لە بنجاخەکانی فاتیکانا پارێزراوە باشترین نمونەن بۆ ئەو جۆرە دەسەڵاتە .

لەلایەنی کردارەوە شتێ نییە رێی ئەوە بگرێ کە زەوی چەقی پشتگیرییەو بەپێی ئەو بزووتنەوەی هەسارەکان و ئەستێرەکان، لێك دەدەنیەوە .

«پیتولومی ئەسکەندرانی» تێگەیشتن و بۆچوونەکەی ئەرستۆی بەرامبەر بە گەردوون لا پەسەندبوو ، کەوتە لێکدانەوەی بزووتنەوەی هەسارەکان وە توانی بە وردی وەسفی سوڕگەکانی بکات . ئەم لێکۆڵینەوانەی پیتولومی بۆ ماوەی نزیکەی هەزار ساڵێك خزمەتی مرۆڤی کرد ، بەڵام ئەم سوڕگانە جگە لە سوڕگە خڕەکانی مانگ و رۆژ نەبێ زۆر ئاڵۆزبوون ، هەریەکەیان جیاوازی لەگەڵ ئەوی دیدا هەبوو ، ئاڵۆزییەکەش بەڕادەیەك بوو لە سەدەی چواردەهەمدا (دوندی) بۆ دەرخستنی سوڕگەکانی ئەو حەوت هەسارەیەی ئەو کاتە ناسرابوون چواردە ساڵ بە روستکردنی سەعاتێکی ئەستێرە ناسییەوە خەریکبوو ،

هەیە دەپرسێ چ هەڵەیەك لەم جۆرە پەیڕەوە داهەیە ؟ وەبۆچی دەبێ وازی لێ بهێنین و پەیڕەوێکی دی بخەینە جێگا ؟ لە کاتێکدا دەزانین کە لە خزمەتی مرۆڤدایە ، لە وەڵامی ئەم جۆرە پرسیارانەدا ، دەگوترێ مرۆڤ کە هەوڵی دۆزینەوەی نهێنییەکانی گەردوون و ژیان دەدا ، هەمیشە ئاواتی ئەوەیە زۆرترین و فراوانترین زانیاری بێ گری و ئاڵۆز بەدەستبهێنێ .

پەیڕەوەکەی ئەرستۆ پیتولومی ، پەیڕەوێکی ئاڵۆزە ، ڕێڕەوی ئەستێرەکان تیایدا ناچنە خانەی وەسفێکی یەکگرتووی تەواوەوە ، ئایا دەتوانرێ وەسفێکی دی بۆ گەردوون، دابنرێ کە بتوانێ وێنەیەکی سادەترو فراوانترمان بداتێ ؟

بۆ ئەوەش دەبوو چاوەڕوانی کۆپرنیکوس لە ساڵی ١٥٤٣ ی زایینیدا بکرێ .

## لە کۆپەرنیکوسەوە بۆ نیوتن

. کۆپەرنیکوس بۆ وەڵامی پرسیارێك دەگەڕا ، ئاخۆ بۆچی سوڕگەکانی هەسارەکان ئاڵۆزن ، ئەو وەڵامەی چنگی کەوت ئەمەبوو «چونکە ئێمە لە زەوییەوە سەیریان دەکەین ، ئەی ئاخۆ ئەگەر لە شوێنێکی دی وەك رۆژەوە سەیریانبکەین چیمان بۆ دەردەکەوی ؟ چ دەبێ ئەگەر رۆژ بکەینە چەق و کارێکی وا بکەین زەوی و ئەستێرەکان بەدەوریدا بسووڕێنەوە ؟ ئاخۆ ئەوسا شێوەی سوڕگەکان چۆن بێ ؟ لێکۆڵینەوە بیرکارییەکانی کۆپەرنیکوس دەریخست کە هەمو هەسارەکان بە زەویشەوە لەم حاڵەتەدا بە سوڕگەی خڕی سادەوە بەدەوری رۆژا دەسووڕێن ، بەم شێوەیە کۆپەرنیکوس پەیڕەوێکی ئاڵۆز کە زەوی چەقی بوو گۆڕیی بە پەیڕەوێکی ساکار کە چەقەکەی رۆژە .

بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێین : کۆپەرنیکوس هیچ بەڵگەیەکی هەستیارانەی وای بەدەستەوە نەبوو

پاڵپشتی تیۆرەکەی پێبکا ، هەر بۆیەش بڵاوکردنەوەی کتێبەکەی ، کە بەڕاستی بە شۆڕشێك لە مێژووی فیکرا دائەنرێ ، بۆ دواساڵی ژیانی دواخست . لەگەڵ ئەوەشدا تیۆرەکەی بەخێرایی برەوی پەیدانەکرد ، بەڵام لە سەد ساڵی دوایداو بەهۆی تەقەللای بەرەوداوی سێ پیاوی مەزن بیرەکانی کوپەرنیکوس لە زانستی ئەستێرەناسیدا شوێنیپێیان جێگیربوو .

یەکەم پیاویان (تایکوبراهە)ی دانیمارکی بوو ، لە ئەنجامی تێڕوانینی ئەستێرەکانا بەهۆی ئامێری وردەوە توانی زانیاریی زۆر ورد ، دەربارەی شوێنە جیاوازەکانی رۆژو مانگو ئەستێرەکانو هەسارەکان کۆبکاتەوە ، بەڵام ئەم پیاوە ئایینناسە لە تێبینیەکانیا شتی وای بەدەست نەهێنا کە ببێتە پاڵپشت بۆ تیۆرەکەی کوپەرنیکوس .

دووەم پیاو (جوهانس کبلر) یاریدەری (تایکوبراهە) بوو ، کبلر زۆر بڕوای بە بیرەکانی کوپرنیکوس بوو ، بەهۆی زیرەکیو کارامەیی خۆیەوە توانی لەو زانیاریانەی (براها) کۆیکردبوونەوە یاسا ناوبانگەکانی دابنێ کە بە ووردی وەسفی ڕێڕەوی هەسارەکانو سوڕگەیان بەدەوری رۆژو بزووتنەوەیدا بکات .

دەریخست ئەم ڕێڕەوانە خڕ نین ، شیوەیان (هلیلیجی)یە ، بزووتنەوەی هەسارەکانیش بە دەوری رۆژدا دەچێتە ژێر خانەی پەیوەندیەکی ساکاری بیرکاریدا ، نەك بۆ چەند پەیوەندیەکی جۆراوجۆری لێكجیاواز وەك ئەو حاڵەی کە زەویمان بە چەقی پشتیگری دانابوو .

دوا بزماریش گالیلیو بەهۆی ئەو تیلیسکۆبەوە کە خۆی پەرەیپیدابو ، وە ئاراستەی مانگو هەسارەکانی کرد ، بە تەرمی تیورەکەی ئەرستوێ داکوتا . لەناو هەندێ شتی دیدا کە گالیلیو دۆزیەوە ئەوەبوو هەسارەی (زوهرە Venus چوارچێوەی وای هەیە کە پیشانی ئەدا بۆ چوونە ناو زەویەوە بەدەوری رۆژدا دەسووڕێتەوە ، بەم شێوەیە تیورەکەی کوپەرنیکوس ئەو بەڵگە هەستیارەی کە جاران نەیبوو کەوتە چنگی . کەچی لەگەڵ ئەمانەشدا گالیلیو بە دادگا درا ، ناچاریان کرد واز لە بیروباوەڕەکەی بە تیوری کوپەرنیکوس بهێنێ .

یەکێ لە ڕێکەوتە سەیرەکان ئەوەبوو لەو ساڵەدا کە گالیلیو مرد (اسحق نیوتن) لەدایكبوو ، دەبوو ئەم زانا مەزنە ئەوەی گالیلیو دەستیپێکرد ئەم تەواوی بکات نیوتن لە ئینگلترە لە ساڵی ١٦٤٢ ی زایینیدا لە دایكبوو ، وڵاتی ئەم لە ئیتالیا نەرمو نیانتر بوو ، تیورەکانی کوپرنیکوسو گالیلیو لە ئینگلترە بەوشێوەی ئیتالیا بەربەرەکانی نەکران .

نیوتن سەرنجێکی ژیرانەی تەنە گەڕۆکەکانو پەیوەندیان بە کاتو شوێنا دا ، وە توانی یاسا بەناوبانگەکانی لەبەر رۆشنایی ئەو سەرنجانە بنیاتبنێ ، ئەو یاسایانەی بە وردی وەسفی پێوەندی نێوان هێزو ئەکسیلەریشنی کرد ، بەتایبەتیش خۆی بە هێزی ڕاکێشانی زەوییەوە خەریككرد ، بەو تێڕوانینە زیرەکانەی توانی ئەم تیورەی بەسەر هەموو تەنە ئاسمانییەکانا بگونجێنێ ، لێرەشەوە گەیشتە یاسا بەناوبانگەکەی کە پێیدەووتری (یاسای کرافیتیشن) .

نیوتن بەهۆی یاساکانییەوە توانی ئەوە بسەلمێنێ کە سوڕگەی ئەستێرەکان بەدەوری رۆژدا لە شێوەی هێلکەییدایە ، لەمەشدا ڕاستی زانیارییەکانی کبلری دووپاتکردەوە ، کە ئەویش لە ئەنجامی لێكدانەوەی زانیارییەکانی (براهە) دا بۆی ساغبوبووەوە .

بیری باو لای ئەستێرەناسانی سەردەمی نیوتن ئەوەبوو کە گەردوون، لە ژمارەیەکی گەورەی سنووردراو لە ئەستێرەی چەسپاو لە شوێنی خۆیداو بە ڕێكوپێکی دابەشکراوی بە شوێنێ بۆش دەوروەدراو پێكهاتووە .

کاتێ نیوتن یاسای گشتی «کرافیتیشن»ی بەسەر ئەم گەردوونەدا سەپاند بۆیدەرکەوت ئەو هێزی ڕاکێشانەی لەنێوان ئەستێرەکاندا کاردەکات دەبێتە هۆی کەوتنیان بەرەو چەقێكو پەیڕەوی گەردوونیش وێراندەکات . لەبەرئەوەی حاڵ بەپێچەوانەی ئەمەوەیە ، نیوتن گریمان کاریەکی کرد کە گەردوون لە ژمارەیەکی بێپایان لە ئەستێرە چەسپاوەکان کە نەگۆڕن لەشوێنی خۆیاناو بە ڕێكوپێکی بەناو ئەو گەردوونە مەنگە بەربڵاوە بێپایانەدا ، دابەشکراون پێکهاتووە .

### تێڕوانینی نوێ بەرامبەر بە گەردوون

ئەم بۆچوونانەی دەربارەی گەردوون لەمەوپێش باسمانکردن تا سەرەتای سەدەی بیستەم باوبوون ، ئەوەی شیاوی باسە لە سەدەی نۆزدەهەمدا

بەرەنگاربوونێکی بنەڕەتیشی تووش بوو بەهەموو دۆزینەوەکانی ئەستێرەناسی سویسری (لوشا تولیە)و ئەستێرەناسی ئەڵەمانی (ئولبزر)ەوە ، ئەم دوانە هەریەکەیان بەجیا دژوارییەکی دیاریان دۆزییەوە . لە کاتێکدا گەردوون لە ژمارەیەکی بێپایان لە ئەستێرە چەسپاوەکان پێکهاتبێ ، کەواتە پێویستە لای تاریك لەشەودا لە ئاسمانا نەبێ چونکە بەهەر لایەکدابڕوانین ئەستێرەی پرشنگدار دەبینین ، وەدەبێ ئەم کۆمەڵە ئەستێرە فراوانەش چەند جارێ لە ڕۆژ زیاتر ئاسمان ڕووناك بکاتەوە .

بەڵام ئەگەر گەردوون لە ژمارەیەکی سنووردار لە ئەستێرەی چەسپاو پێکهاتبێ ، بەپێی یاساکانی نیوتن ئەبێ بەرەو چەقی بارستە نەگۆڕەکەیان بوەرێن و بکەون ، ئەمەش وەك باسی لێوەکرا دەبێتەهۆی وێرانبوونی گەردوون .

بەڵام هیچ یەکێ لەم دوو حاڵەتە ڕەچاو نەکراوە . ئاسمان لە شەودا تاریکەو گەردوونیش لە حاڵەتی هەڵوەرین و وێرانیدا نییە ، کەواتە چاری ئەم دژوارییە چییە ؟

پێویستە جیرۆکەکەمان بگێڕینەوە بۆ بیستەکانی ئەم سەدەیە ؛ بۆ ئەو کاتەی لە ئەمەریکادا تیلیسکوپێك کە تیرەی ئاوێنەکەی ١٠٠ (انج) بوو دروستکراو لە چیای (ویلسون) لە کالیفورنیا دامەزرێنرا ؛ هەندێ تیلیسکوپ دەریخستبوو کە (فضاء) (٢) جگە لە ئەستێرەکان چەند پەڵەیەك ڕووناکیی نارێکی تیایە ناویان نابوو «هەوری تەماوی

کاتێك ئادوین هابل لە ساڵی ١٩٢٤ دا تیلیسکوپەکەی چیای ویلسونی ئاراستەی هەورە تەماوی ئەندرومیدا کرد بۆی دەرکەوت لە ژمارەیەکی گەورە لە ئەستێرەی وەك ئەو ئەستێرانەی لە «گالاکسی» یەکەی ئێمەدا هەیە کە پێی دەڵێن ـ ڕزگەی کێشان،
پێکهاتووە . تەنانەت (ئەندرومیدا) خۆی لە خۆیدا گالاکسیەکە دەکەوێتە دەرەوەی سنووری گالاکسی ئێمە . ئەوەندەی نەخایاند ئەستێرەناسەکان ژمارەیەکی دی گالاکسییان دۆزییەوە بۆ ئەم مەبەسەش دوو هۆیان بەکارهێنا :
تیلیسکوپی گەورەو وێنەی فوتوگرافی . بەم شێوەیە گالاکسییەکان ، نەك ئەستێرەکان بوونە بەردی بنەڕەتی گەردوون کە لە توانای تیلیسکوپدا هەیە بلیۆنهای تریان لێ بدۆزێتەوە .

ئەی ئەو دژوارییەی لوشاتولیە ـ ئولبرز کە باسمانکرد ؟

(هابل) دوو دیاردەی سەرەکی کە پەیوەندییان بە گالاکسییەکانەوە هەیە : دۆزییەوە ، یەکەمیان بە هەر ئاستێکدا بڕوانی دەبێ ئەو چڕییە ناوەندییە لە گالاکسییە پرشنگدارەکاندا ببینی .

دیاردەی دووەم کە گرنگترە ئەوەیە کە ئەو شەبەنگە ڕووناکییەی لە گالاکسییەکانەوە دێ تووشی سوورە جێ‌پێ لێژبون بووە (٣) ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ ئەم گالاکسیانە مەنگ نین ، گەڕۆکن هەندێکیان لە هەندێکی دییان دووردەکەونەوە .

هابل ئەوەی دۆزییەوە کە خێرایی لێك دوورکەوتنەوە لەگەڵ دووریی گالاکسییەکەدا دەگونجێ ، ئەم دۆزینەوەیە تێڕوانینمانی بەرامبەر بە گەردوون ئاوەژوو کردەوە ؛ هەروەها چارەشی بۆ دژوارییەکەی لوشاتولیە ـ ئولبرز ـ دۆزییەوە ، واتە تێڕوانین و بۆچوونی باوو پەسندی ئێستا بەرامبەر بە گەردوون ئەوەیە : لە ژمارەیەکی زۆر گەورەو سنووردار لە گالاکسی پێکهاتووە ، مەنگیش نییە ، دەکشێ ، وا لە گالاکسییەکان دەکا کە لێك دووربکەونەوە . هەروەهاش چەقێکی دەستنیشانکراوی نییە . بۆ نموونە ڕێگای کاکێشان لە شوێنێکی نموونەییدایە وەك هەموو گالاکسییە نموونەییەکانی دی ، ئێمە لە گالاکسییەکی نموونەییەوە بۆ هەر لایەك بڕوانین سمپلێکی ناوەندی (٤) لەم گەردوونە دەبینین .

شایانی باسە کە گالاکسییەکان تاقە پێکهێنراوی گەردوون نین ، چونکە گەردوون بە تاریفی نوێ تێکڕای هەمووی بریتییە لە کەرەستە ، تیشکدانەوە ، کات ، شوێن .

چۆن ئەم گەردوونە دروستبوو ؟ ئایا سنووردارە یان بێپایان ؟ شێوەی چۆنە ؟ گالاکسییەکان لەچی پێکهاتوون و شێوەیان چۆنە ؟ ئایا ژیانێکی دی لەم گەردوونەدا جگە لە ژیانی ئێمە هەیە ؟ ژیان چۆن و لەکوێ دەستیپێکرد ؟ ئایا ئەو یاسا فیزیاوییانەی دەیزانین بەسەر ئەم گەردوونەدا دەسەپێنرێ ؟ ئایا ئەم یاسایانە هەمیشە باشن ؟ ئەم پرسیارانەو گەلێك پرسیاری دیش هەن کە ئادەمزاد پێویستە وەڵامیان بداتەوە یان هەوڵی وەڵامدانەوەیان بدات .

پەراوێزەکان : ئەو زاراوانەی لێرەدا بەکارهێنراون ئەمانەن :

* گالاکسی = : مەجەرە

* ئەکسیلەریشن = تسارع : واتە تێکرایی کاتی بۆگۆڕانی خێرایی تاو .
* کرافیتێشن = تجاذب : یەکتر ڕاکێشان ، یەکتر کێش‌کردن ، هێزی یەکتر ڕاکێشانی نێوانی هەموو تەنەکان .
* اهلیلجی : شێوە هێلکەیی

فضاء : لە هەندێ زاراوەدا (بۆشایی) یان (ئاسمان) یان بۆ داناوە ، من بەلامەوە پەسند نەبون ، نەشم‌ویست شتی بۆ دابتاشم .

سوورە جێ‌پێ لێژبوون = ازاحه حمراء

سمپلی ناوەندی = نموونەی ناوەندی = عینە وسطیـە

چەسپاو = ثابت

کەرەستە = مـادە

تیشک‌دانەوە = اشعاع

لەنگەرگیراو = سکـون

هەستەکان = حواس

ئاووهەوا = منـاخ

قوللـە = بـرج

چـەق = مرکـز

خەپلەی‌بەرین = قرص منبسط

گومەز = قبـــە

گۆیـــی = کـروی

هەسارە = کواکـب

بنجـاخ = سجـل

پشتگیری = اسـناد

سوڕگـە = مـدار

ئالـۆز = معقـد

پەیڕەو = نظـام

ڕێڕەو = مســار

هێزی ڕاکێشانی زەوی = قوه الجاذبیه الارضیه

تەنی ئاسمانی = جرم سماوی

سنووردار = محـدود

گریمانکاری = افتراض

مەنگـ = ساکـن

بێ‌پایان = لا متناهی

بەرەنگاربوون = تحـدی

دژواری = تناقض

بارسـت = کتلـــە

تیـرە = قطـــر

هەوری تەماوی = غیمـــە سدیمیە ، «هەورێکی تەماوی کە بریتیە لە خاکە ئەستێرە »

ڕێگای کاکێشان = درب التبانە

ئاست = اتجـــاه

چڕی ناوەندی = ناوەندەچڕی = کثافـە وسطیە

شەبەنگی روناکی = طیف الضوء =

تێبینی : بۆ ساغ‌کردنەوەی ئـەم زاراوانەی لـــەم باسەدا هاتوون سوودم لـــەم ســەرچاوانەی خوارەوە ، وەرگرتوە :

١ ـ فەرهەنگی زانستـی مامۆستا کەمـال جەلال غەریب بەشی یەکەم
٢ ـ فەرهەنگی زانستی مامۆست کەمـال جەلال غەریب بەشی دووەم
٣ ـ بەشە دەستنووسەکانی فەرهەنگـی زانستی مامۆستا کەمال جەلال غەریـب
٤ ـ پەروەردەو زانست ـ ژمارەی تایبەتـی فەرهەنگی زاراوەکانی قوتابخانە

## فەرهەنگی زانایان لـەم باسـەدا

١ ـ نیکولاس کوبیرنمیکوس ١٤٧٣ ـ ١٥٤٣
ئەستێرەناسێکی پۆلەندی بوو ، شۆڕشێکی لە زانستو ئایـنو روناکبیریدا بەرپاکرد بـەو واتەیەی ووتی : ڕۆژ چەقی کۆمەڵەی خۆرە ، زەویو هەسارەکانی دیـش بـە دەوریـا دەسوڕێنەوە .

٢ ـ جوهانس کیبلر ١٥٧١ ـ ١٦٣٠
ئەستێرەناسێکی ئەڵەمانی بـوو ، زانیاریەکانی کوبرنێکوس کـاری تێ‌کردبـون ، لەدوایدا ئەوەی دۆزیەوە کـە خێرایـی هەسارەکان کاتێ لــە ڕۆژ نزیك‌دەبنەوە زیاددەکـاتو کاتێکیش دووردەکەونەوە کەم دەبێ

٣ ـ گالیلیو گالیلی ١٥٦٤ ـ ١٦٤٢
ئەستێرەناسێکی ئیتالی بوو ئەوبو کە تیورەکەی کوپەرنیگوســی دەربارەی ســوڕی زەوی چەسپاند .

٤ ـ اسحق نیوتـــن ١٦٦٤ ـ ١٧٧٢ زانایەکـی انگلیزی بو لە سروشت ناسیدا کاری کـردە سەر بیروباوی ســەدەی هەژدەیەم یاسـای کرافیتێشنـــی دۆزیـەوەو میکروبـی عەکس‌کەرەوەی داهێنا ، هەروەها ئەوەشـی دۆزیەوە کە چۆن تیشکی سپی بە تێپەڕبوونی بە (منشورا) دەبێتە چەند ڕەنگێك .

# تیپێکی کوردی لەپاریس

«بنوو ئایشێ هەتا هەتایە بنوو
من چۆن دەتوانم لەدوای تۆ تامی ئەوین بچێژم»

ئابەو سەرەتا پڕ سۆزو جۆشەوە کە تێکەڵی دەنگــو ئاوازی ــ بزق ــ بوو بوو ..

بەڕێوەبەری تیپی فۆلکلۆری کوردی لە باریس سەرەتای گۆرانیيە خەمبارەکەی هەڵرشت ..ئەم گۆرانیيە داستانی خۆشەویستیو ئەوینی ــ بوزان بەگ ــ دەگێڕێتەوەو باسی ئەوە دەکات کە بوزان بەگی جەنگاوەرو شەیداد ئەوینداری خاتوو ئایشێی کچە میرو میرزادە چەنــدێ ئایشێی بەراستی خۆشویستوەو چەند ســاڵ لە پێناوی ئــەو خۆشەویستیيە پیرۆزەدا جەنگاوەو ناخۆشیو ئازارو شەونخوونی کردوەو بیــری لە بەیەك گەیشتنو دەسی لەمل مەرازکردن کردۆتەوەو لــە ئەنجامدا هیواکەی هاتۆتە دیو مارەیان کردوە لێیو شایی لۆغاز، سازکراوەو بەڵام چارەنووسی وادەبێ کە بووك واتا خاتوو ئایشێ لەشەوی زاوابوونــدا بەجوانەمەرگی سەربنێتەوە ..

لەو ئاهەنگەدا کە تیپە فۆلکلۆرییە کوردییەکە لە پاریس پێشکەشی کــرد .. گــەلێ سروودی نەتەوەییو گۆرانی بەســۆز پێشکەشکرا .. یەکــێ لەوانە گۆرانییەکی پڕ لە جۆشش بوو کچە گۆرانــی بێژی سەرنج راکیشو ئەفسوونەوی ــ غولیزیــر ــ پێشکەشی کرد .. شایانی باسە ــ ئیبۆ ــ دووزەلەی کوردی بۆ لێداوەو ــ زینار ــ تەنبوورەی بۆ ژەندوەو ــ بۆتان ــ جمشــی بۆ لیداوەو ــ عەدنــان ــ بێش ئاوازی (بزق)ی دارشتوە .. دەبێ ئەوەشمان لەبیــر نەچێ کە بزق لێدانی عەدنان زۆر کاریگەرەو ناخی هەناوو دەروون دەبزوێنێو جێگــای شایانی خۆی لە قووڵایی دڵدا دەکاتەوە ...

# بنێشت بۆدەرخستنی دان رەش بوون

کومپانیایەکی پزیشکی جۆرەبنێشتێکی پزیشکی بۆ مندال دروست کردوە وان رەش بوونی منــدال دەرئەخات . ئەمەش بە روش بوونی بنێشتە سپییەکە کاتێ کە دانەکە روشبێ . بنێشتە تازەکەش لەگــەڵ بنێشتی تردا جیاوازی نیەو هەر ئەو چێژە شەکری پرمیووەیەی هەیــە .

# ئامێــری سینەما

هەندی پزیشکی ئامێرێکیان بۆ وێنەگرتنی دڵ درووست کردوە پێی ئەڵێن ئامێری سینەما کــــە فرمانی وێنەگرتنی ی‌ایێدانەکانی دڵ بە تیشکی ئێکس لە سەر قلیمێکی ی‌ئاسایی .

ئەم ئامێرە بە ورەی هاتوچۆی‌خوێنو بارستەی فڕێدانی خوێن لە دومارەکاندا لەهەموو چرکەیەکــدا دیاری ئەکات . ئەم ئامێرە نوێیە بە خێرایيەکــــی سەرکەوتوانەو ئامانجی ورد دۆخەکانی دڵ تۆمــــار ئەکـــان .

# ئەوەی کە سی‌یەکی نویــان بۆدروست کــرد مــــرد

سیلفس بیلس کە تەمەنی هەژدەسالی بــوو خەڵکی لیۆنە پاش پێنج هەفتە تێپەڕ بوون بەســـەر کاری‌چاندنی ی‌سێیەکی نوێ لە جێی سیيەکــــەی خۆی کە ئەنجامی کارەساتێکی رێگاوبان لەوەوپێشــــی تووشی هاتبوو مرد. ئەم کچەی کەسییەکەی ئەنجامی سوارەوونی مۆتۆرێك سییەکەی دانزابوو کـــــاری چاندی سی کە بە کارێکی پزیشکی ودگمــــەنو ورو لەقەلەم ئەدرێ لە لیۆن بۆ هێنرایــــە بـــــەردوە . پزیشکەکان بەلایانەوە وابوو کە ئەم کاروپزیشـــکییە قۆناغی گواستنەوەیە بۆهێنانەوەسەر خۆی ســـیی دووەم کە ناتوانی بەئیشی سروشتی خۆی هەستێ بەڵام کارە پزیشکییەکە سەری نەگرت ئەمــــەش بەهۆی ئەوەو نا کەوا لەشی کچەکە ئەوسییە نوێیەی نەویستووە کە واچێنراوە .

تا ئێستا تەقەلای چل کاری وا لە جیهاندا دراوە بۆ اچندنی سیو یەکەم کاری پزیشکی کەوا سەرکە ــ وتنی یەرکەوت سالی ١٩٦٨ بوو کەوا دوکتور ویرهۆم وهوبرۆی پروفیسرۆری بەاچیکایە هەلسان بـــــە چاندنی هەردوو سیی نەخۆشێکو دوای ئەوکــــارە نەخۆشەکە نۆمانگ ژیا . لە ژاپۆن ئەم کارە بۆ چاندنی یەك سی سێ جار سەرکەوتوو بووە .

## ئۆتۆمبیلی دوا ڕۆژ :

## بیر دەکاتەو قسە دەکات

ئەوەندەی نەماوە ئەو ڕۆژە بێت ئۆتۆمبیلێکی وا دروست بکرێت لەگەل مرۆڤ بدوێ . تۆتۆمبیلێکی ئەلەکترۆنی‌یە دەتوانێ بیر بکاتەوەو قسە بکـــاتو ئاگاداری شوفێربکاتـــەوە .

لە مێژەیە کۆمپانیا مەزنەکان بیر لەوە دەکەنەوە وەك ئەم جۆرە تۆتۆمبیلە دروست بکەن .. بەڵێ ... وا ئەم بیرە کەوتە کارو ئێستا دەست کرا بە نەخشە ــ دانانی جۆرە تۆتۆمبیلێك کە بەهۆی ئەلەکترۆنەوە کار بکـــات .

کۆمپانیاکان بەرنامەیێکی ئەوتۆیان ئامادەکردووە کە بەهۆیەوە بتوانن لە دەوروبەری ساڵی «١٩٨٤»ەوە پارچەی کلیلی ئەلەکترۆنی (دەشبول)، کە بتوانــێ بدوێ .. بەرهەم‌بهێنن . وە دەنگێکی بەرگوێ ئەبــێ کەوا شوفێرەکە بەهەمرو شتێك ئاگادار بکاتـــەوە . بە وێنە ، بە شوفێر ئەڵێ : تکایە ، دەرگای راســت چاك دانەخراوە .. یا وا خەریکە سووتەمەنی تــەواو دەبێ .. ئا بەم جــۆرە .

بەڵێ .. رەنگە مۆدیلی داهاتوو وا دروســـت بکرێ کە شاشـەیێکی تەلەفریۆنی تێدا بێت گشـــت زانیاری پێویســـت .

پێشکەش بە شوفێر بکات .. نەخشـــــەی هاتووچۆو گەڕانەوەشی بۆ لەسەر شاشـەکە پیشـــان دەدات .

« دنیس ری » گەورە ئەندازیارانی ئەلەکترۆنی لە پیشـەسازی ئۆتۆمبیل‌دا دەڵێ : ساڵی هەشتاکان چەرخی ئەلەکترۆنی ئەبێ لــــــە دروســـــتکردنی ئۆتۆمبیلەوە . ئێستـاکە هەر سێ گەورە کۆمپانیاکانی ئەم بابەتەی ئەمریکا کێشـەو مشتومڕیانە ســەباردت بەوەی کامیان دەتوانێ کارەکانی ئەلەکترۆنی چاکتـــر پێش‌بخاتو پەرەی پێ بسێنێ . لەهەمعان کاتیش‌دا کۆمپانیاکانی یابانی ، رەنگە ئەورووپایش ، بە هەمــان کاردا هەڵبســـن .

هەرچەندە ئەمە زۆر نهێنی‌یەو تا ئێســـتا زۆر شت لەم بارەوە روون نەبووەتەوە ، بەڵام زانیـــاری ئەوتۆ هەیە دوپاتی پێشخستنی «سنووقی‌دەنگـــیی پێویست » دەکات ، کەوا لە پارچـەی ئیشارەت‌دان دەکات کە ، بدوێ . وە بە رێگای ئەم سنووقـــەوە شوفێری‌ناهوشیار ئاگادار دەکرێتەوە کەوا . بـــۆ وێنە ، گڵۆپەکان واگیرساوون یان دەرگای ئۆتۆمبیل دانەخراون .. یان ... هتــد .

ئەو زانیاری‌یە (نهێنی)یانەی لەبـارەی ئـــەم سنووقەوە گەیشتوون وا بەرچاو دەخەن کـــــەوا سنووقەکە بە شوفێر دەڵێ : بۆ وێنە ، ئیشـــارەتی سوور لەسەر پارچەی کیلەکان داگیرســـاوە .. وە شوفێر بە هۆی پێ‌بوونی ئەم ئیشـارەتە ئاگادار دەکا ــ تەوەو ئاراستەی دەکات کە چی بکاتو چۆن چاکــی بکاتەوە .

## تەلەفزیۆنو ڕادیۆو ریکـۆدەر پێکەوە

کـۆمپانیای (شارپ)ی ژاپۆنـی لەم دوایی‌یـەدا

کۆمپانیای (شارپ)ی ژاپۆنـی لــەم دوایی‌یەدا ئیم‌و ــ ئەی ئیم )و ریکۆدەری میکرۆ کاسێت لەگەڵ تەلەفریۆنێکیی سێ ئینجی‌ی ڕەش‌وسپی ، ئــــەم ئامێرە زۆر سووکەو تەلەفزیۆنەکەی ئێستکەی نێرەری بێ شومار وەردەگرێتو ، ڕیکۆردەرەکەی دوو خێرایی هەیە دەتوانێت تێپ زوو تۆمار بکات .

## کەم سەرف‌کردنی کارەبا

تەنگ‌وچەلەمەی ووزە لە ڕۆژئاوادا پاڵی بـــە سوێدی‌یەکانەوە ناوە شێوازێك بدۆزنەوە یارمەتـــیی بەفیڕۆنەدانی ووزە بدات ئەویش بەپێی توانـــــاو رووناکی‌ی شـەقامەکان باشترین نموونەیە ، چونکــە هەندێك جار گڵۆپەکان بەدڕێرایی شـەو بەداگیرساوی دەمێننەوە بێ ئەوەی کەسێك یان ئۆتۆمبیلێـــــــك تێ‌بپەڕێت ، بەتایبەتی لە ڕۆژانی سـەرماو ســـۆڵەی ئەو وولاتەدا .. سـەرف‌کردنی ئەو رووناکی‌یـــەی کە خزمەتی کەس ناکات بەفیڕۆدراو دادەنرێت ، بۆیە کۆمپانیایە سوێدی‌یەکە نەخشـەی ئەوەی کێشـــاوە مەڵبەندەکانی رووناك‌کردنەوە لە شـەقامەکان‌دا چاوێکی ئەلکترۆنیان تێدای دەبینیت کە شارەزایی هەبێت، ئەم چاوە دەبنێت وا ئۆتۆمبیلێك یان مرۆڤێك تێ‌دەپەڕێت، فەرمانێکی خێرا بە هەموو گڵۆپەکان دەدات گـــورج دابگرسێن ، ئیتر گڵۆپەکان دادەگرسێن تاکــــــــوو ئۆتۆمبیلەکە یان مرۆڤەکە تێ‌دەپەڕێت .

ئێستا نەخشـەی ئەوە دەکێشن ئەم داهێنانــە بە کارگەو قۆتابخانەو کۆمپانیا گەورەکان‌دا بلاوبکە ــ نەوەو لەو باوەڕەدان کە ساڵی مایۆنەها دۆلاریــــان بۆ دەمێنێتـــەوە .

# هونەری منداڵ



منداڵ جیهانێکی یەکجار چڕو پڕەو جیهانێکی تەلیسماویی بێبنە شیکردنەوەی هێماکانی دڵو دەروونی منداڵ بە ئاسانی بۆت نایەتە بەردەست . هەرکە هەستە ناسکەکانی پەڕوباڵێ گرت بەتایبەتی هەستی هونەری ئینجا پەلەقاژێ لە دەوروبەری خۆیدا دەکاو جوولانەوەی ناوەوەی هەردەم لە تەقینەوەدا دەبێ بەهەر جۆرێ بێ دەیەوێ شتێك بڵێ ، شتێك دەربڕێ، شتێك بکا . چونکە مەسەلەکە مەسەلەی هەستو دەروونە پاکەکەیەتی کە جۆشی دەداو پاڵی پێوە دەنێ بۆ ئەم جیهانەی ببا کە جیهانی هونەرە ئینجا لێرە هونەرەکەشی هونەرێك دەبێ تایبەت بە خۆی .

هونەرێکە (تعبیر) لەو دڵو دەروونە ناسکەی دەکا .

ئەو دەروونەی کە تاکو ئێستاکە بایی سەری دەرزێ تەڵخو لێڵ نەبووەو لە ئاوی کانیاوێك پاكو ڕوونترە.

جا منداڵی بەهرەوەر ئەو شتەی کە ناتوانێ بە زمان بیڵێ بە هونەرەکەی دەری‌دەبڕێ وەکو بە ڕەسم کردن.

لەم حاڵەتەدا خەیاڵی ئەم جۆرە منداڵانە لە ئەندازە بەدەر دەبێو رۆژ لەدوای ڕۆژ ئاسۆی بیرو خەیاڵیان زیاتر دەکرێتەوەو هونەرەکەشیان زووتر پەرەدەسێنێتو مامەڵەشیان لەگەڵ خۆیانو واقیعیاندا گەش‌تر دەبێت . دەڵێن کە منداڵ تا بێ گەورە بێ هونەرەکەشی لەگەڵ خۆیا گەورە دەبێو بەخێوی‌دەکا بەڵێ ئەمە ڕاستە (بەڵام بەڕای من هەندێ منداڵ هەیە ئاستی هونەرەکەی لە ئاستی‌تەمەنی گەورەترو بەرزترە ئەوەش دەگەڕێتەوە سەر ئەوەی کە دیاردەکانی هۆش‌و هەستی ئەم منداڵە زووتر پێ‌گەیشتوەو مەسەلە تەمەنییەکەی دوای خۆی خستووە ) ئینجا لەم قۆناخە هونەریەی ئەم منداڵەدا کە قۆناخێکی یەکجار ناسکە دەبێ بەوپەڕی لەخۆ خۆشبوونەوە ئاگاداری لێوە بکرێو پێویستییەکانی هونەری بۆ هونەروەری بچکۆلە نابێ بە هیچ جۆرێ پشت‌گوێ بخرێ . بەڵکوو بەپێچەوانەوە دەبێ هەردەم بۆی ئامادەبکرێ تاوەکو داهێنانە هونەرییەکانی هەر لە هوباب دابێو

**نووسینی : دارا محمد علی**




پێشبکەوێ ، لەم قۆناخـــەدا دەربڕینەکانـــی دڵو دەروونو هەستو مێشکی یەکجار پیرۆزو بـــەرزو بەهێز دەبن ، دەگاتە پلەیەك کـــە هونەرمەندانـــی پێگەیشتوو بۆ ئەم چوونو دەربڕینە ناچن کەوا ئـــەم ساوایە بۆیچووە .

بەڵێ هەروەك هونەمەندی جیهانـی بیکاســـۆ گووتویەتـی :

« زۆر شت لە هونەری منداڵانـــەوە فێربووم »

کەوابوو هونەرمەندێکی گەورەی وەك بیکاسۆ کە ئـــەم ڕایە دەردەبڕێ بەرامبەر بە هونەری منداڵ ، دەباشـــە ئاخۆ دەبێ دووریی‌و قوولی هونـــەری منـــداڵ تـــا چ ڕادەیەك بێ ، هەر لەبەر ئەوەیە کە هونەری منداڵ بـــە هونەرێکی نوێ لەقەڵەم دراوە . واتە هونەرێکە بـــە هیچ جۆرێك لاسایی سروشت ناکاتەوەو هونەرێکـــە دوورە پەرێز لە تۆمارکردنی واقیع ڕادەوەستێ بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەوەی لـــە ناخییـــەوە هەڵدەقوڵـــێ دەیدرکێنێ‌و دەیخاتە سەر قاقەز . چونکە جارێکـی تر بیکاسۆ دەگەڕێتەوەو دەڵێ :

( من ئەو شتە ڕەسم ناکەم کە دەیبینم ، بەڵکوو ئەو شتە ڕەسم دەکەم کە بیری لـێ دەکەمەوە ) ..

کەوابوو جیهانی هونەری منداڵەکە لەگەڵ جیهانـــی هونەرمەندە نوێخوازەکان، لەم خاڵەدا یەکتردەگرنەوە. یان ئەوە تا هونەری تـــەڕو ناسکی دەروونە بـــێ گوناهەکان کاری لە هونەرمەندی ئیسپانی (خـــوان میرۆ)ش کردووەو زۆرەها تابلۆیە تازەکانی مۆرکـــی تەواوی جیهانی هونەری منداڵانی پێـــوە نووســـاوە بەڵام من سێ‌ودووی لێ ناکەم‌و دەڵێم :

«هیچ هونەرمەندێك توانای ئەوەی نیە خـۆی بهاوێتە باوەشی هونەری پاكو بێگەردی منالأنەوە .. واتا لاسایی ئەوە بکاتەوە کە گوایە وەکـــو منـــداڵ رەسم‌دەکا .. نەخێر ئەمە درۆیەو دوورە لە هەمـــوو ڕاستییەکی هونەری » ..

# یانەی رۆشنبیران

* بەڕێز کاك عبد الرحمان شیخ رحیم لە خانقین :

نامەکەت کە بریتی بوو لە چیرۆکێ بەناوی (ژیان)ـ ەوە پیمان گەیشت . لەبەرئەوەی کە بابەتی گۆڤاری «بەیان» بوو .. ناردمان بۆیان .. تکامان ئەوەیە کە لەمەودوا گۆڤاری «رۆشنبیری نوێ» لە بەرهەمە بەنرخەکانت بێبەش نەکەیت .
داوای سەرکەوتنتان بۆ ئەکەین .

* بەڕێز کاك نجات خۆشناو لە هەولێر :
نامەکەت کە بریتی بوو لە هۆنراوەیەك بەناوی «ناکامی شیعر» پێمان گەیشت . لەبەرئەوەی کە بابەتی گۆڤاری «رۆشنبیری نوێ» نیە .. بۆ رۆژنامەی «هاوکاری» مان نارد . تکامان وایە کە لە پاڵ شیعر دانانا جاروباریش روویەك لە پەخشان بکەیتەوەو لاپەڕەکانی گۆڤارەکەت بە وەرگێڕان یا ئامادەکردن یا بە بەرهەمی سوودبەخش بڕازێنیتەوە . لە دوایی‌دا داوای سەرکەوتنتان بۆ ئەکەین .

* بەڕێز کاك شێروان حسن حسنی لە هەولێر :

نامەکەت کە هەڵبەستێکە بە ناوی «کە بەخۆمدا ئەچمەوە» پێمان گەیشت . لەبەرئەوەی بابەتی «رۆشنبیری نوێ» نیە ناردمان بۆ «هاوکاری» .
تکامان وایە کە لەمەودوا لەپاڵ هۆنراوەیش‌دا نووکی قەڵەمەکەت تۆزی لە مەیدانی رۆشنبیری‌دا بخرێتە کارو گۆڤارەکەتان «رۆشنبیری نوێ» لە بەرهەمە بەسوودەکانت بێبەش نەکەیت . داوای سەربەرزیتان ئەکەین .

* بەڕێز کاك ایوب عمر هەمەوەندی .. لە کەرکوك : نامەکەت گەیشت ... داوای چەند ژمارەیەك لە گۆڤاری «رۆشنبیری نوێ»ت کردبوو .. وا بۆمان رەوانەکردی . داواکارین کە نامەمان لێ نەبڕێو پەیوەندیت لە گەڵمان‌دا بەهێزتر کەیت .
ئیتر زۆر سوپاس .

* بەڕێز کاك عزیز رشید حریری لە هەولێر :

هۆنراوە وەرگێڕاوەکەت کە بە ناوی «لوبنان ناکەوێو لە نێو ناچێ» ، پێمان گەیشت . بەڕاستی وەستایانەو کارمانە لە عەرەبیەوە وەرتگێڕاوە ، کە وێنەی سۆزو بۆکروزی دڵی سووتاوی بۆگەلی لوبنانی تیایا رەنگ ئەداتەوە . زۆرمان پێخۆش بوو کە بۆت بڵاوبکەیتەوە بەڵام لەبەرئەوەی هەڵبەستە .. بۆیە بۆ گۆڤاری «بەیان» ـمان نارد .
ئومێدەوارین کە گۆڤاری «رۆشنبیری نوێ»یش لە بەرهەمە بە سوودەکانت بێبەش نەکەیت . لەگەڵ سوپاس‌و سەرکەوتن‌دا .

* بەڕێز کاك اسماعیل .. لە کەرکوك :
نامەکەتمان پێگەیشت .. تیایا پرسیار ئەکەیت « .. ئەگەر ژیانی ناودارو سەرگوزشتەی کەڵە شاعیرەکانی کورد بنووسم ، بڵاو ئەکەنەوە ، یان نا ؟ . »

براگیان : بابەتی لەمە چاکتر کوانێ .. ئەگەر بێت‌و هەوڵێکی خەست بدەیت خۆت خەریك کەیت بە نووسینی ژیاننامەی چەند گەورە کوردێ ، چی لە مەیدانی جوڵانەوەی رۆشنبیری دابێ یا لە جوڵانەوەی نیشتمانی‌دا .. ئەوە نرخی هەر تەواو نابێ ، بەتایبەتی کۆکردنەوەی باس‌و خواست لەسەر ژیانی گەورە پیاوان وەختێکی زۆرو ماندوبوونێکی فراوانی گەرەکە . ئیتر کورد واتەنی : ئەمە ئەرزو ئەمە گەز .

* بەڕێز کاك عبد العزیز حسن عزیز لە هەولێر :
نامەکەت کە بریتی بوو لە پارچە شیعرێك کە سەرەتاکەی (بە وەسیەت نامەیە بۆ یار گەر مردم) (پارچەیەك لە پرچی بخاتە کفنم) دەست پێ ئەکا پێمان گەیشت . جا لەبەر ئەوەی بابەتی «رۆشنبیری نوێ» نیە .. بۆ «بەیان» ناردمان .. داواکارین کە لەمەودوا ..بەرهەمی شیعرت بۆ «بەیان» یا بۆ «هاوکاری» بنێری . ئێمەش لە بەرهەمی رۆشنبیری گشتی بێبەش نەکەی .

Roshinbiry Nwe
General Cultural Monthly
Magazine
Issued by: Kurdish Culture
and Publication House
Ministry of Culture and
Information
Baghdad - Iraq

رۆشنبیری نوێ
مجلة ثقافية شهرية عامة
تصدر عن دار الثقافة والنشر الكردية
وزارة الثقافة والاعلام
بغــداد

رئيس التحرير
مصلح مصطفى الجلالي

ناونیشان : دار الثقافة والنشر الكردية ساحة الجلالي بغداد
تەلەفون ٨٨٧٥٧٩٥ پێنج خەتە

ئەم ژمارەیە ٨٠٠٠ دانەی لێ چاپکراوە

نرخی ١٠٠ فلسە

رقم الايداع فى المكتبه الوطنيه ببغداد ١١٢ لسنه ١٩٧٩